

# پیرەمێردی بەرتریفەی مانگەشەو

## ١٠٠ حەقایەتی چینی

وەرگێڕانی

**هێمن عومەر خۆشناو**

هەولێر – ٢٠١١



**وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان**
**بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی وچاپ وبڵاوكردنەوە**
**بەڕێوەبەرایەتی بڵاوكردنەوەی هەولێر**

ناوی كتێب: پیرەمێردی بەر تریفەی مانگەشەو (١٠٠ هەقایەتی چینی)

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: مخلص دوچونگ

وەگێڕانی بۆ كوردی: هێمن عومەر خۆشناو

پیتچنین: هێمن عومەر

نەخشەسازی بەرگ: ئـ . خالد

نەخشەسازی ناوەڕۆك: نەورۆز جەمال

چاپی یەكەم – چاپخانەی ڕۆشنبیری – هەولێر/ ٢٠١١

لەبەڕێوەبەرایەیتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان

ژمارەی سپاردنی (١١٤٨) ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە

(١)

# چما بەکارهێنانی تەورداس بۆ مریشك کوشتن؟



ئەم هەقایەتە لە هەڵبژاردە ئەدەبییەکانی (کۆنفۆشیۆس) وەرگیراوە.

(یان یان)، قوتابی (کۆنفۆشیۆس) و فەرمانڕەوای (وشینگ) بوو، جارێکیان کۆنفۆشیۆس چووە (وشینگ)و لەوێ گوێی لە ئاوازی ئامێری قانوون‌و دەنگی گۆرانی بوو. کۆنفۆشیۆس پێی وابوو ئاهەنگی زێدەعەزافی لەو شێوە، لەو ولاتە بچووکەدا کارێکی زێدەڕەوییە، بۆیە بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەجارییانەوە گوتی: (چما تەورداس بەکارهێنان بۆ مریشك کوشتن؟)

(یان یان)یش بەرگری لە خۆی کردو رایگەیاند، ئەوەی ئەو دەیکا مامۆستاکەی هانیداوە، بەتایبەتی بۆ ئەوەیە تا فەرمانڕەوایی (وشینگ) باشتر بەڕێوەببا.

ئەو کات کۆنفۆشیۆس لە هۆکاری وتەکانی (یان یان) گەیشت‌و گوتی:

– ئەو تەنیا رادەبوێرێ.

لەنۆپاش، دەربڕینی ( **چما بەکارهێنانی تەورداس بۆ مریشك کوشتن؟**) بۆ وەسفی ژاوەژاوێکی گەورە، کە لە دەوری مەسەلەیەکی پرو‌پوچ دروست بێ، یان بلاوکردنەوەی بەهرەی کەسێك لەسەر کارێکی پرووپوچ، بەکاردەهێنرێ.

جارێکیان (کۆنفۆشیۆس) لە شاخی (تای) بوو دەگەڕا، لە هیکەوە گوێی لە دەنگی سەردولکەو لاواندنەوەی ژنێك بوو، کە لەسەر گۆڕێك راوەستابوو. لێی نزیك کەوتەوەو پێی گوت:

—لە کاتی بیستنی نالەو گریانی تۆ، نیگەرانیو خەمت گەورە دیارە.

ژنە وەڵامی دایەوە:

— (بەڵێ، پڵنگ خەزوورەکەمی کوشتو هەڵیلووشی. پاشان رووبووە مێردەکەمو ئەویشی بە هەمان قەدەر برد. ئێستاش دوای ئەوە پڵنگێکی تر کوڕەکەمی لرف کرد)

کە (کۆنفۆشیۆس) ئەوەی گوێ لێبوو. لێی پرسی:

— ئێ باشە بۆ ئێرە جێناهێڵی؟

ژنەکە وەڵامی دایەوە:

— ئاخر لێرە دەستەڵاتێکی ستەمکار نییە.

ئەنجا (کۆنفۆشیۆس) رووی لە قوتابییەکانی کردو پێی گوتن:

—گەنجینە لە بیرتان بێ ها !، ستەمکاری، لە پڵنگیش بەزەڕترە.

لەوەبەدوا، ئەم دەستەواژەیە بۆ هۆشداری دانە فەرمانڕەوایان بەکاردێت، ئەگەر فەرمانڕەواکە بە شێوەیەکی دیکتاتۆریانە رەفتار بکا، هەروەها ڕەخنە لەو حکومەتانە دەگرێ کە گەلەکانی خۆیان سەرکوت بکەن.

(٣)

# کلکە بیور دروستکردن



پارچە شیعری تاشینی کلکە بیور، لەنێو دەقی گۆرانییەکدایەو لە کتێبی گۆرانیدا باس دەکریٚ:

**((چۆن کابرا دەتوانیٚ کلکە بیور دابتاشیٚ؟ خۆ بە بیٚ بیور ناتوانیٚ ئەم کارە بکا. پیاو چۆن دەتوانیٚ، بە بیٚ پێناوێك و خەمخۆرێك ژن بێنیٚ، یان بە بیٚ مشورخۆری هاوسەرگیری ناتوانیٚ ئەم کارە بکا!))**

بە پشت بەستن بەم وتەیە، مشوورخۆرانی هاوسەرگیری لەوە بەدوا، دەزانن کلکە بیور دابتاشنو بە مشورخۆرانی هاوسەرگیریو رێکخەرانی ئەم ئیشەش دەگوترێت، وەستای کلکە بیوران.

(٤)

# سووربوون لەسەر شەڕ، خۆ فەوتاندنە



ئەم هەقایەتە لە (زو زوان)ەوە وەرگیراوە.

لە ساڵی ٧٤٣ ی پ.ز، (وۆشینگ) ی فەرمانڕەوای ویلایەتی (زنگ)، گەیشتە تەختی فەرمانڕەوایەتی. دایکێکی هەبوو، حەزی بە چارەی ئەو کوڕەی خۆی نەدەهاتو خۆشی نەدەویستو (دوان)ی کوڕی گچکەترێی بە گەورەتر دەزانی.

دایکە، فەرمانڕەوای رازی کرد کە شاری (جینگ) ی کۆن، بداتە (دوان) ی کوڕیو تا ئەو شارە بکەویتە بن دەستی.

دوای ئەوەی (دوان) شارەکەی گرتە دەست، شوورەی شارەکەی بەتینتر کردو زۆری بەرزتر کردو هەر بەردەوام بوو لەسەر فراوانکردنی محاری بن دەستەلأتی.

وەزیرەکانی (زینگ) بە فەرمانڕەوایان گوت، کە (دوان) لەسەر سەقامگیری (زینگ) بۆتە مەترسی، دەبێ ئەو هەنگاوانە بگریە بەر تا دەستی بەسەردا بگری.

بەڵام فەرمانڕەوا پێی گوتن:

—ئەو کەسەی لەسەر شەڕ سوور بێ، خۆی بە فەوتاندن دەدا.

داوای لە راوێژکارەکانی کرد، کە چاوەڕێ بن بزانن ئاخیری چ دەقەومێ.

(دوان) یش سوپایەکی گەورەی بۆ هێرشکردنە سەر (زینگ) ی پایتەخت کۆکردەوە. ئەو کاتە (وۆشنگ) گوتی:

— ئێستا کژیەتی.

سوپایەکی بۆ هێرشکردنە سەر (جینگ) ئامادەکرد. جینگییەکان هەر زوو بە سەر (دوان)دا سەرکەوتنو ئەوانیش ناچار بۆ ویلایەتی (وی) هەڵاتن.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **سووربوون لەسەر شەڕ خۆفەوتاندنە**، بۆ ئاگادارکردنەوەی دەستدرێژیکەران بەو قەدەرەی چاوەڕێیانە، بەکاردەهێنرێت.

یەك شیَ، دەکاتە ٣٠ لی (نزیکەی ١٥ کیلۆمەتر)، رۆژە ڕێیەکی تەواوە بە پیادەیی.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بەهارو پایزاندا. میر (چۆنگر) لە ویلایەتی (جین)ی زێدی خۆی دوورخرابووەوە. ماوەی نۆزدە ساڵان لەم ویلایەت بۆ ئەو ویلایەت دەهاتو دەچوو. هەر کە گەیشتە (چۆ)، فەرمانڕەوای (چۆ) بە ڕێزەوە کە شیاوی فەرمانڕەوای پێشوو بیَ، پێشوازی لێکرد.

رۆژێکیان فەرمانڕەوا لە (چۆنگر)ی پرسی:

– ئەگەر رۆژێك گەڕایتەوە زێدی خۆتو گەیشتییەوە سەر تەختی دەستەڵات، چۆن پاداشتم دەدەیتەوە؟

چۆنگریش وەڵامی دایەوە: قوربان! ئەی خاوەن شکۆ، کۆمەڵە کوپێکت لا هەیە، نازانم ئەم دیارییە چییە کە شیاوی جەنابتان بێت!؟

کە فەرمانڕەوای (چۆ) هەر لەسەر پرسیارەکەی سوور بوو، (چۆنگر) وەڵامی دایەوە:

– ئەگەر رۆژێك ناچار بووم لە مەیدانی شەڕدا، لەگەڵ سوپای جەنابتان بجەنگم، بۆ دەربڕینی هاوپەیمانێتیم بۆ بەڕێزت، سیَ (شیَ) یان سوپاکەم دەگەڕێنمەوە.

پاش ماوەیەك، (چۆنگەر) گەڕایەوە (جین)و گەیشتەوە سەر تەخت. (چۆ) خاکی (سونگ) ی داگیرکردو ئەمە بووە هۆی ئەوەی ناکۆکی بکەوێتە نێوان (جین)و (چۆ)، لەبەر ئەوەی (جین) لەگەڵ (سۆنگ) بۆتە هاوپەیمان.

کاتێکیش سوپای (چۆ) هەڵیکوتایە سەر سوپای (چۆنگر)، سوپای (چۆنگر) داوای لە پیاوانی خۆی کرد کە سێ شێیان بکشێنەوە دواوە، واتە نەوەت لی، وەك وەفایەك بۆ ئەو بەڵێنەی پێش چەند ساڵێك لەبەرامبەر فەرمانڕەوای (چۆ) دابووی.

سوپای (چۆ) لە شەڕو کوشتار بەردەوام بوون، ئاخیریش هەر نشوستیان هێنا.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **کشانەوە سێ شییان**، بۆ ئاماژەدان بە خۆبەدەستەوەدانی بە ئەنقەست، یان سڵەمینەوە لە کارێك بەرامبەر هێزێکی گەورە، بەکاردەهێنرێ.

## (٦)

# ڕێگایەکی قەدبڕ بۆ بەزاندنی (گۆ)
# کە لێو نەمێنن، چەقە چەقی ددانان دێ



لــە ســاڵی ٦٥٨ی پ. ز، ویلایــەتی (جــین) چــەند دیارییــەکی جــوانی بــۆ فەرمانڕەوای ویلایەتی (یۆ) ناردو داوای لێکرد ڕێگا بە سوپاکەیان بدا لە نێو خاکی (یۆ)، بە ئامانجی هێرشکردنە سەر ویلایەتی (گۆ)، ڕێگایەکی قەدبڕ ببڕن.

وەزیرێکی ویلایەتی (یۆ)، ئامۆژگاری فەرمانڕەوایەکی خۆی کرد، کە ڕێگایان پێ نەداو پێی گوت:

– (یۆ) و (گۆ) وەکو ددانو لێو وان، کە لێو نەمێنن، ددانان لەسەرمان چەقە چەقیان دێ. کە دەست بەسەر (گۆ) داگیرا، دوای ئەو (یۆ)ش دەبێتە قوربانی.

بەڵام فەرمانڕەوای (یۆ)، چونکە زۆری کەیف بە دیاری وەرگرتن دەهات، لەسەر داواکەیان رازی بوو. بەم جۆرە، دوای ئەوەی سوپای (جین) ویلایەتی (گۆ)ی تێكو پێك شکاند، لە ڕێگای گەڕانەوەش (یۆ) یان داگیرکرد.

دواتر، دەربڕینی ڕێپێدان بە ڕێگایەکی کورت بۆ شکاندنی (گۆ)، واتە بەکارهێنانی کەسێك بۆ ئازاردانی خەڵکانی ترو هەروەها دواتر ئازاردانی کەسی یەکەمیش.

بەڵام کاتێك لێو نامێنن، لەسەرمان ددانەکان چەقە چەقیان دێ، ئاماژەیە بۆ ئەوەی: لە کاتی لاچوونی لایەنێك کە پەیوەندی بەهێزی بەویترەوە هەیەو موویان لەبەینی وەناچی، ئەوەی تریش دەکەوێتە مەترسییەوە.

(٧)

# پرسیار کردن لە پەیکەرەکان



لە سەردەمی بەرەبابی (کسیا) دابوو، نۆ پەیکـەری زەبـەلاحی برۆنـزی داڕێـژران و وەك رەمزێك بۆ دەستەلاّتی بالاّ لە دەرباری شانشینیی دا پیشان دەدران. کە ئـەم بەرەبابە فەرمانڕەوایە لەناوچوون، پەیکەرە برۆنزییـەکان، بـۆ سـەردەمی هـەردوو بەرەبابی (شانگ)و (زو) گواسترانەوە.

لەســالّی ٦٠٦ی پ. ز، فـــەرمانڕەوای ویلایـــەتی (چـــۆ)، کـــە تـــەنیا بـــەناو فەرمانڕەوای هەموو ویلایەتـەکانی چـین بـوو، هاتـە محـاری پاشـا (زو)، کـە پاشـا ئەفسەرێکی نـاردە بـەخێرهێنانی فـەرمانڕەوای (چـۆ)، فەرمانڕەوایەکـە پرسـیاری لەبارەی قەبارەو کێشی نۆ پەیکەرەکەی نێو دەربار لێکرد.

ئەفسەرەکەش وەلاّمی دایەوە:

= سەرەڕای ئەوەی بەرەبابی (زوو) لەناوچوون، بـەلاّم هێـشتا دەسـەلاّتیان لـە ئاسماندا هەر وەکوو خۆیەتی. بۆیە کـەس مـافی ئـەوەی نییـە پرسـیار لـە بـارەی پەیکەرەکانەوە بکا.

لـەوە بـەدوا، دەربڕینـی پرسـیارکردن لـەبارەی پەیکـەرەکان، ئاماژەیـە بـۆ پیلانێك، بۆ گەیشتن بە دەسـەلاّتێکی دیـاری کـراو، یـان هـەولّ دان بـۆ شـەرەف و خانەدانییەکی گەورە، یان پلەو پایەیەکی بەرز لە بوارێکی دیاریکراودا.

## (٨)

# پەنجەی خستە نێو قازانەکە



لەساڵی ٦٠٥ی پ. ز، چەند نوێنەرێك لە ویلایەتی (چۆ)، کیسەڵێکی گەورەو بێ ڕەزایان پێشکەشی فەرمانڕەوای ویلایەتی (زنگ) کرد، فەرمانڕەواکەش فەرمانی کرد لێیبنێن، تا لەگەڵ ئەو خانەدانانە بخوا.

(زی گۆنگ) کە ئەفسەرێکی گەورە بوو لە (زنگ)، لە ڕێگای چوونە زیافەتەکە، هەستی کرد کە پەنجەی دەلەرزێ، بۆیە بە (زی جیا)ی برادەی گوت:

– ئەو پەنجە لەرزینەی من، واتە بەختم بە شتێکی زۆر بەتامو خۆش هەیە.

فەرمانڕەوای ویلایەتی زنگ ئەم خەبەرەی بیست، بۆیە لە کاتی ڕاخرانی سفرەی زیافەتەکە، نەیهێشت (زی گۆنگ) دەست بۆ کیسەڵەکە ببات. (زی گۆنگ) تووڕە بوو گەلەکیشی برسی بوو، بۆیە پەنجەی لەنێو ئەوقازانە هەڵێنا کە کیسەڵەکەی تێدا لێندرابوو، ئینجا پەنجە بە ئاوگەکەی مشتو ئەوێی بەجێهێشت. فەرمانڕەوای (زنگ)یش هێندەی لێ پەست ببوو پتت لێدابا دەتەقی، بەجۆرێك ویستی (زی گۆنگ) بکوژێ، بەڵام دواتر لە کودەتایەکدا بە دەستی (زی گۆنگ) سەری لە لاشەی جیا کرایەوە.

بەم شێوەیە، دەربڕینی دەستی خستە نێو قازانەکە، ئاماژەیە بۆ بردنی پشکێك لە شتێ، کە بردنی قەدەغە بێ.

(٩)

# قامچییە درێژەکەش ناگاتە هەموو شوێنێک



لە ساڵی ٥٩٥ی پ. ز، ویلایەتی (چۆ) نێردراوێکی ناردە ویلایەتی (کی)، کە نێردراوەکە بە ویلایەتی (سۆنگ)دا تێپەڕی، بۆ حەیابردنی فەرمانڕەوا، بە قەستی فەرمانڕەوای سۆنگی لە هێڵی گەشتەکەی ئاگادارنەکردبۆوە، بۆیە فەرمانڕەوای سۆنگ داوای لە سێدارەدانی نێردراوەکەی کرد.

ویلایەتی (چۆ) یش هێرشی کردە سەر (سۆنگ)، هەردوو لا گەیشتنە رێگایەکی بن بەست بۆ کوشتار. لە ساڵی پاشی، ویلایەتی (سۆنگ) داوای هاوکاری لە ویلایەتی (جین) کرد. وەزیرێکی ویلایەتی (جین) یش کە ناوی (بوزونگ) بوو، بە فەرمانڕەواکەی خۆی گوت:

– هەرچەند قامچی درێژ بێ، بەڵام ناگاتە هەموو شوێنێك، ئێستا ویلایەتی (چۆ) بەهێزە، بۆیە لە بەرژەوەندی ئێمەدا نییە لەگەڵ ئەو ویلایەتە بکەوینە جەنگەوە، لەبەرئەوە تکا دەکەم هەتا کاتێکی لەبار، چاوەڕێ بە.

بەم شێوەیە، ویلایەتی چین نوێنەرێکی ناردە (سۆنگ) بۆ ئەوەی بە فەرمانڕەواکە رابگەیەنێ کە خۆبەدەستەوەنەدا، چونکە هێزو تفاق بە زوویی دەگات، بەڵام هیچ هێزو ئیمدادێك نەنێردرا.

دوای ئەمە، دەربڕینی **(قامچی درێژیش ناتوانێ بگاتە هەموو شوێنێك)** ئاماژەیە بۆ شتێکی دوور لە دەستکەوتی کەسەکە، یان دەسەڵاتەکەی، یاخود بۆ کەسێکی زۆر دوور کە یارمەتیدانی سەخت بێ.

لە ساڵی ٥٩٤ی پ. ز، سوپای ویلایەتی (چۆ)، هێرشی بردە سەر ویلایەتی (سۆنگ)، بەلاّم نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێ، خۆی لە شەڕێکی دوورو درێژ و شەکەتبوو بینییەوە. ئەو وێرانکەرانە خانوویان دروست کردنو زەوییان کشت کرد، تا ئەوە دەربخەن کە ئەوان بۆ شەڕێکی دوورو درێژ حازرن.

فەرمانڕەوای (سۆنگ) بەم کارەی زانیو، شەوێ یەکێك لە گەورە ئەفسەرەکانی کە ناوی (هوایۆن) بوو ناردە نێو خێوەتگای چۆییەکانو (زەی فان)ی فەرماندەی سوپای (چۆ) ی لەخەوێ قیت کردەوەو پێی گوت:

= حاڵو بارو زروفی ویلایەتی (سۆنگ) خراپەو، خەڵکەکە مردنیان لە خۆبەدەستەوەدان پێ باشترە، هەروەها گوتی ئەگەر لەشکری (چۆ) ٣٠ (لی) بکشێتەوە دوا، لەوانەیە دانوستانو رێککەوتن روویدات.

(چۆ) بەو پێشنیازە رازی بووو لەشکرەکەی پاشەکشە پێکرد.

دوای ئەوە فەرمانڕەوای (چۆ) و فەرمانڕەوای (سۆنگ) ئاشت بوونەوەو لەسەر پرەنسیپی فێلم لێمەکە تا فێڵت لێنەکەم، رێك کەوتن.

(هوایۆن) وەك بارمتەیەك خۆی رادەستی (چۆ) کردو بەمەش شەڕ کۆتایی پێهات.

دواتر ئەو دەربڕینە پێچەوانە بووەوەو بووە فێڵم لێ بکەی، فێڵت لێدەکەم. ئەمەش بۆ ئەو کەسانە بەکاردێ کە لەیەکتر بە گومانن.

## (١١)

# هێزێکی زیاتر بۆ فرۆشتن



لـە سـاڵی ٥٨٩ی پ. ز، کاتێـك ویلایـەتی (کـی)، ویلایـەتی (لـو)ی هاوسـێی داگیرکرد. ویلایەتی (جین) سوپایەکی بۆ رزگارکردنی (لو) نارد. کـە سـوپا لەگـەڵ سوپای (جین) دەستەویەخە بـوو، (غـاوغو) ژەنـەڕاڵێکی سـوپای ویلایـەتی (کـی) بوو، بەردێکی لە یەکێك لە سەربازەکانی (جـین) داو بـەدیلی گـرتو عارەبانەکـەی لێـستاند. (غـاوغو) لـە رێگـای گەڕانەوەیـدا عارەبانەکـەی بـەخۆی دەهاژووشـتو درەختی هەڵکەنراوی شاتووی لەسەر قایم کردو لەنێو گۆڕەپانی شەڕگەی سـوپای (کی) دەسوڕایەوەو هاواری دەکرد:

**=ئەوەی هێزی گەرەکە، با بێتو ئەوەی بەجێم هێشتووە بیکڕێ!**

لەوەبەدوا، دەربڕینی (هێزی زیاتر بۆ فرۆشتن) مانای ئارەزووی هـەرە زۆر دێ، بۆ شەڕو کوشتار لای کەسێك، یان بەمانای هێزێکی زیاتر دێ. بە زۆریش بۆ پەسن کردنی کابرایەکی ئازاو رەشیدو بەهێز بەکاردێت.

ساڵی ٥٤٧ی پ. ز، ویلایەتی (چۆ) ویلایەتی (زنگ)ی داگیرکرد. (چوانفنگ کسۆ) کە ژەنەڕاڵێکی (چۆ) یی بوو، (هۆنگ کسی)ی ژەنەڕاڵی لەشکری (زنگ) ی بەدیل گرت. بەلاّم (وی)ی میری (چۆ)ییەکان، ویستی بەرهەمی ئەم بەدیل گرتنە بدووریێتەوە.

(چوانفنگ کسۆ)و (میر) بڕیاریاندا، بەناوبژیوانی (بوزولی)ی ژەنەڕاڵی چۆییەکان، ئاشت ببنەوە. ئەم ژەنەڕاڵە داوای کرد با کابرای دیل خۆی پرسیار لەو کەسە بکا کە بەدیلی گرتووە، بۆیە جارێکی تر (هۆنگ کسی) ئامادەبوو، (بوزولی) دەستی خۆی بەرەو لای میر (وی) هەڵتەکاندو، گوتی:

– ئەم پیاوە میر (وی)یە، ئەو لە جێی برایەکی ڕێزلێگیراوی فەرمانڕەوامانە.

پاشان دەستی بە ئاراستەی (چۆنفنگ کسۆ) داناوەو گوتی:

– ئەم پیاوە چوانفنگ کسوە، قازیی ناوچەیەکی دوورە دەستە، ئێستاش پێم بڵێ کێ بوو تۆی بە دیل گرت؟

(هۆنگ کسی) لە مەبەستەکە گەیشتو وەلاّمی دایەوە:

= بە ڕێکەوت میرم بینی، ئەو کاتە من شکا بووم.

بەم جۆرە لەبەر خاتری دیلەکە ئەم پایەی بەدەستهێنا.

دواتر، دەربڕینی بەرزرکردنەوەی دەستو نزم کردنەوەی، بۆ پەنا بردنە بەر فێڵو هاوکاری کردن بە ناپاکیو گاڵتەکردن بە دەستکەوتەکان بەکاردێت.

## (١٣)

# هاوڕێیەتی نێوان (گوان) و (باو)



لـە چـەرخی بـەهارو پایزانـدا، (گـوان زۆنـگ) سـەرۆك وەزیرانێکـی بـەناوبانگی ویلایەتی (کی) بوو، حوکمەکەی وا تیژ بوو، (کـی) کردبـووە بـەهێزترین ویلایـەتی ئەوسا. بە جۆرێك دەسەلأتی بەسەر هەموو ویلایەتەکانی تردا دەشکا.

(گوان زۆنگ)و (باوشویا) لە منداڵییەوە برادەربوون‌و بیٚ یەکتر نەدەحەوانـەوە. کە خۆیان لە کاری بازرگانی کوتا، (گوان زونگ) پـشکی قـازانجی زیـاتر بـۆ خـۆی برد، بەلأم (باوشویا) گوێی نەدایێ، چونکە وای دانابوو کە (گوانگ زۆنـگ) دەسـت کورتەو دەبێ چاوێکی لە پیرەدایکەکەی خۆی بیٚ.

(گوان زۆنگ) چەند جارێك لە پرۆژەی جۆراوجۆردا نـشوستی هێنـا، (باوشـویا) ئەم تێکەوتنەی بۆ بارو زروفی نالەبار گەڕاندەوە نەك بۆ خودی (زۆنگ) خۆی.

دوای ئەوە، (گوان زۆنگ) خزمەتی مـیر (جیـو)ی کـردو (باوشـویا)ش خزمـەتی میر (کیسابو)ی دەکرد. ئەو دوو میرەش لەسەر تەختی دەسـەلأت بـووە شـەڕیان، (کیسابوو) سەرکەوت‌و سەری (جیو)ی پەل داو (گـوان زۆنـگ)یـشی بـەدیل گـرت. (باوشـویا) دەیزانـی کـە (گـوان زۆنـگ) پیـاوێکی بـە توانـاو سیاسـەتمەدارێکی گەورەیە، بۆیە لە بەرامبەر فەرمانڕەوای نوێدا پێشنیاری کرد، کە ئەگـەر دەیـەوێ ببێتـە سـەرکردەیەکی بـەهێز، پێویـستە (گـوان زۆنـگ) بکاتـە سـەرۆك وەزیـران. فەرمانڕەواش بە پێشنیارەکە رازی بـوو، دوای ئـەوە گـوان زۆنـگ لـە پۆسـتەکەی دەست بەکار بوو، ئەوەندە خۆی پێشخست، وای لێهات لە (باوشـویا) زیـاتر جێـی گرنگیپێدان بوو، دوای حەوت ساڵان، ویلایەتی (کی) بەسـەر هـەموو ویلایەتـەکانی تر سەرکەوت.

زۆر جاران (گوانگ زۆنگ) دەیگوت:

– خەڵکی خۆم، هەڵیانبژاردمو مەزنیان کردم، بەلأم تاکە کەسێك کە من بە تەواوی دەناسیٚ (باوشویا) یە.

لەوەبەدوا، (**هاوڕێیەتی نێوان گوانو باو**) دەربڕینێکە بۆ وەسفی هاوڕێیەتییەکی بەهێزو دامەزراو لەسەر لێك تێگەیشتنی هەردوولا بەکاردەهێنریٚ.

## (١٤)

# مالآتی هەلآتووش ناتوانێ بگاتە لای هەندێکیان



لە ساڵی ٦٥٦ی پ. ز، ویلایەتی (کی) بۆ هێرش بردنە سەر ویلایەتی (کای)، سەرکردایەتی هاوپەیمانییەتێکی لەشکرەکانی کرد، دوای شکانی (کای)، لەشکرەکان ویلایەتی (چۆ) یان داگیر کرد. (چۆ) نێردراوێکی نارده لای لەشکری (کی)، گوتی:

= محاری ئێوه لە دەریای ژوورووەو محاری ئێمەش لە دەریای خوارووداییە، هەتا ئاژەڵی هەڵاتوویش ناتوانێ بگاتە محارەکەی تر. ئەدی باشە چی ئێوەی هێناوەتە ئێره؟

(کی)یەکان بە چەند بیانووێك پاکانەیان بۆ کارەکەیان هێنایەوە. بەڵام دیار بوو (چۆ) لەسەر بەرگری کردن سوور بوو. ئاخیری هەردوو لا لەسەر ئاشتەوایی رێك کەوتنو لەشکرە هاوپەیمانییەکان هەریەکە بەلایەکدا پەرشو بڵاو بوون.

لەوە بەدوا، دەربڕینی (**هەتا ماڵاتی هەڵاتوویش ناتوانێ بگاتە لای هەندێکیان**)، بۆ ئاماژەدان بە نەبوونی هیچ خاڵێکی هاوبەش لەگەڵ ئەوانی تر، بەکاردەهێنرێ.

## (١٥)

# گیاکردنە ریسی و ئەنگوستیلە دانان لەنێو دەم



(وی ووزی) کــە بــاوکی (وی کــی) بــوو، فەرمانبــەرێکی گــەورەو دەســت ڕۆیشتوو بوو لە ویلایەتی (جین)ی چەرخی بەهارو پایزاندا، ئەو کابرایە، خـانمێکی باش‌و خۆشەویستی هەبوو، کە پیرەمێرد نەخۆش کەوت، داوای لە کوڕەکەی خۆی کرد، ئەگەر مرد، خانمە خۆشەویستەکەی لە کابرایەکی دیکە مارە بکا، بەڵام دواتر کە حاڵی زۆر شڕ بوو، داوای لە (وی کی) کرد، کە دوای مردنی، ژنەکە بکوژێ‌و لـە نزیك گۆڕەکەی بیشارێتەوە، تا لە ژیانی ئەو دونیاش هەر لەگەڵی بێ. بـەڵام پـاش مردنی باوکەکە، (وی کی) ژنەی نەکوشت، بەڵکو ڕێگـای پێـدا کـە مێردێکـی دیکـە بکاتەوە، پاساوی کارەکەی بەم قسەیە هێنایەوە:

– ئەگەر کابرایەك هێندە نەخۆش بێ، لە گیانەڵا دابێ، لـە قـسەکانی بـەرپرس نییەو حسێب بۆ قسەکانی ناکرێ، بێگومان ئەو کاتە گوێڕایەڵی ئـەو راسـپاردەیەی باوکمم کە پێی راگەیاندم، کە هێشتا عەقڵی ساغ‌و سەلیم بووبێ.

پاش ماوەیەك، کە لەگەڵ (دوهوی) ی فەرماندەی لەشکری ویلایەتی (کین)، لە شەڕێکی سەخت دابوو, سەرنجی دا پیرەمێردێك وا هانەهانیەتی لە ماندوێتیان لـەو شەڕگەدا ریسیە گیایـان دەپێـچێتەوە. ئەسـپی (دوهـوی) لـە یـەکێك لـەو تەپکـەو تەڵانە گیر دەبـێ‌و دواتـر (دوهـوی) بـەدیل دەگـیرێ، لـە هـەمان شـەودا (وی کـی) خەون بەو پیرەمێردە دەبینێ‌و لە خەونەکەدا پێی دەڵێ:

– من باوکی ئەو ژنەم کە تۆ رزگارت کرد، وا پاداشتی پیاوەتییەکەتم دایەوە.

پەندێکی دیکەی هاوشێوە لە هەقایەتەکەدا هەیە، ئەویش **دانانی ئەنگوستیلەیە لە نێو زاردا:**

لەسەردەمی بەرەبابی (هان) دا، کوڕێکی نـۆ سـاڵان هـەبوو، نـاوی (یـانگ بـاو) بوو، ئەو کوڕە بینی کە کوندەبەبۆیەك پەلاماری چۆلەکەیەکی زەرد دەدا، چۆلەکە

زەردەکە کەوتە سەر زەوی‌و پڵنگیش پەلاماری دا. (یانگ باو) چۆلەکەکەی رزگار کردو بردیەوە ماڵ‌و بە تەنگیەوە هات.

رۆژێکیان کە چۆلەکەکە لە حاڵێکی باشدا بوو، فڕییە شوێنێکی دوور. لە هەمان شەودا، (یانگ باو) خەونێکی دیت، لە خەونەکەیدا وایزانی کوڕێك بە بەرگێکی زەرد خۆی پۆشی بوو، خۆی پیشان داو چوار ئەنگوستیلەی لەنێو زاری خۆیدا هەڵگرتبوو.

کوڕەکە پێی گوت:

**– من نێردراوی شاژنی رۆژئاواو دایکی خواوەندانم. لە بەرامبەر ئەوەی کە منت ئازاد کرد، هاتووم ئەم ئەنگوستیلانەت پێشکەش بکەم، ئەوانەی لە تۆ دەبن پاك‌و بێگەردن وەك ئەم ئەنگوستیلانە دەگەنە پایەی بەرز.**

هەڵبەت، کوڕی (یانگ باو)و نەوەکەی‌و نەوەی نەوەکەی، هەموویان بوونەتە کاربەدەستی گەورە. لەمەوپاش، هەردوو دەربڕینەکە بۆ گوزارشت کردن لە هیوای مەزن‌و گەورە بەکاردێن.

(مەنشوس) بیرمەندێکی مەزنی چەرخی ویلایەتە بەشەڕهاتووەکان بوو، لەو سەردەمایە، پاشایەك هەبوو پاشای (کی)، ناوی (کسوان) بوو، زۆر لە فەرمانڕەوایەتی وڵاتەکەی بێ سەرو بەرو شەپرێو بوو.

(مەنشوس) چووە لای پاشاو پێی گوت:

– کابرایەك هەبوو لەسەر ڕۆیشتن بوو بۆ سەفەرێکی درێژ، پێش ئەوەی بڕوا، پەیمانی لە برادەرێکی وەرگرتو ژنەکەی بردە لای، بەڵام کە گەڕایەوە، دیتی، ژنەکەی لە برسانو لەسەرمان چی تێ نەماوە. لەو حاڵەدا، چ شایانی ئەو پیاوەیە بیکا؟

پاشا وەڵامی دایەوە:

– پێویستە هەموو پەیوەندییەکانی لەگەڵ برادەری ئاوا بپچڕێنێ.

ئەوجارە (مەنشوس) گوتی:

–ئەدی بەندییەوانێك کە ناتوانێ بەندییەکان کڕ بکاو دەزانێ توانای نییە، چی پێویستە لەگەڵ نموونەی ئەو جۆرە فەرمانبەرە بکرێ؟

پاشا گوتی:

– پێویستە لەسەر کارەکەی لابرێ.

(مەنشوس) پرسیاری سێیەمی لە پاشا کرد:

– ئەگەر دەسەڵاتێکی خراپ، وڵات بەڕێوە ببا، چی بکرێ پێویستە؟

پاشا نەوێرا ئەو پرسیارە وەڵام بداتەوە، چونکە لابردنی پاشایە لە تەختی دەسەڵات، چاوێکی بۆ لای یاریدەدەرانی خۆی گێڕا و خۆی گرخاندو قسەکەی بردەوە لایەکی تر.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (چاوگێڕانو بابەت گۆڕین) بەکاردێ بۆ وەسفی خۆدوورگرتن لە پرسیاری نامۆو یان خۆدوورگرتن لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕەخنە.

## (١٧)

# دانیشتن لەسەر تەپۆلکە، بۆ چاوەدێری پڵنگە دڕندەکان



ئەم هەقایەتە لە تۆماری ویلایەتە شەڕکەرەکان وەرگیراوە.

لە چەرخی ویلایەتە شەڕکەرەکان، هەردوو ویلایەتی (هان)و (وی) لە شەڕدابوون، ویلایەتەکانی دیکەش ماوەیەکی درێژ بوو تووشی ناخۆشی بووبوون. پاشای (کین)، بیری لە خۆتێوەگلانی شەڕەکە کردەوە، بەڵام یەکێك لە راوێژکارەکانی پێی راگەیاند، کە چۆن (بیان زوانگزی) پڵنگی کوشتوون؟.

ئەویش پێی گوت:

– جارێکیان، (بیان زۆنگزی) دوو پڵنگی دیتن لە بەرامبەر کەڵەگایەك، ئەویش زۆر هەوڵیدا هەردووکان بکوژێ، بەڵام برادەرەکەی وەستاندیو پێی گوت:

– کە ئەو دوو پڵنگە هەردووکیان لەسەر کەڵەگایەکە بەشەڕ دێنو پڵنگی بچکۆڵە یەکەمجار دەمرێو پڵنگی دووەمیش بە سەختی بریندار دەبێ. بیان زوانگزیش لەو کاتەوە هەر چاوەڕێ دەبێ. پێی وابوو بە ئاسانی ئەو دوو پڵنگەی چنگ دەکەوێ. چی پێ گوترابووو چی بۆ پێشنیار کرابوو، (بیان زوانگزی) وایکردو وابوو پڵنگی گەورە پڵنگی گچکەی کوشتو بۆ خۆیشی بە سەختی بریندار بوو، زوانگزیش توانی بە ئاسانی بیکوژێ.

بەم شێوەیە، توانی و، بە یەك جار هەردوو پڵنگەکەی دەست کەوت. ئێستاش (هان) و (وی) لە شەڕدان، ئاکام دەبێ یەکێکیان دوای ئەوەی بێ هێز دەبێ، تەسلیمی ئەوەی تر بێ، ئەگەر هەردوو ویلایەت هێرش بکەن، بە یەك جار دەتوانن سەربکەون.

پاشای (کین) ئەم پێشنیارەی قبوڵ کردو دواتر بە ئاسانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بەم شێوەیە، دەربڕینی **(دانیشتن لەسەر تەپۆلکە بۆ چاودێری پڵنگە دڕندەکان)** بۆ ئاماژەدانە بە چاوەدێریکردنی بارودۆخێك لە شوێنێکی بێ شەڕو شۆڕ، کە خەڵکی تر خەریکی یەکتر کوشتنن، پاشان دەستکەوتنی دەسکەوتەکان لە دوای شکستهێنانی هەردوو لا.

## (١٨)

# کەروێشکە فێڵزانەکە سێ کونی لانەی هەن سەرینەکەت تەواو دانێ و بەسەلامەتی بنوو



(مونگ چانگجۆن)ی سەرۆك وەزیرانی ویلایەتی (کی)، پیاوێکی مشەخۆری هەبوو ناوی (فانگ کسوان) بوو، (مونگ) ویستی کابرایەك بنێرێتە خاکی (کسو) تاوەکوو قەرز کۆبکاتەوە. (فانگ کسوان) خۆی تەرخان کرد کە بچێ، پێش چوونەکەی، پرسیاری لەوە کرد کە چی پێویستە لەگەڵ خۆی بێنێتەوە؟

(مونگ) پێی گوت ئەو شتە لەگەڵ خۆت بێنەوە، کە لە ماڵ نەبێ.

دوای ئەوە (فانگ کسوان) گەیشتە (کسو) هەموو قەرزەکانی پووچەڵ کردنەوەو چەکی پارەکانی هەموو سوتاندن. پاشان گەڕایەوەو گوتی:

—من دادپەروەریم لەگەڵ خۆم هێناوەتەوە کە لەماڵەوە نییە.

کە (مونگ) لە حارو مەسەلەکەی گەیشت، زۆر تووڕە بوو، بە جۆرێك پێت لێدابا دەتەقی.

ساڵی پاشی، فەرمانڕەوای (کی)، (مونگ شانکچونی) لە پلەکەی لادا، بۆیە گەڕایەوە (کسو)، خەڵکی (کسو) خڕبوونەوە، هەموو بۆ بەخێرهاتنەوەی هاتبوونە سەر ڕێگا، هێندە زۆربوون هێندە زۆربوون ڕێگایان گرتبوو بە چەشنێك مشك دەرباز نەدەبوو.

لەو کاتەدا (مونگ) بە (فانگ کسوان)ی گوت:

— ئێستا ئەو دادپەروەرییە دەبینم کە بۆ منت هێناوە.

(فانگ کسوان) یش پێی گوت:

— کەروێشکی فێڵزان، بۆ لانەو خۆشاردنەوە سێ کونی هەن، بەلأم تۆ ئێستا تەنیا یەك لانەت هەیە، بۆیە لە ئامانو ئاسوودەییدا نیت، دەبێ بچم دوو کونی ترت بۆ هەڵکۆڵم.

فـانگ کـسوان چـووە ویلایـەتی (وی) بـە فەرمانڕەواکـەی ڕاگەیانـد کـە (کـی)، (مونگ)ی لە پلەکەی دابەزاندووە، هەرکەسێکیش لە خزمەتگوزارییـەکانی (مـونگ) سوود وەربگرێ، ئـاخیری دەوڵەمەنـدو بـەهێز دەبـێ. بـەم شـێوەیە فـەرمانڕەوای (وی) نوێنەرێکی لەگەڵ بڕێکی زۆری زێڕو ژمارەیەك لە گالیسکەی نـاردو داوای لـە (مونگ) کرد، کە ببێتە سەرۆك وەزیـران. نوێنەرەکـە سـێ جـارانی سـەردان کـرد، بەڵام ئەو هەموو جارێ ڕەتی دەکردەوە. کە فەرمانڕەوای (کـی) بـەو مەسـەلەیەی زانی، نوێنەرێکی لەگەڵ بڕێکـی زیـاتری زێـرو گالیـسکەو شمـشێر نـاردو داوای لـە (مونگ) کرد کە بگەڕێتەوەو ئـەمجارەش سەرپەرشـتی ویلایـەتی (کـی) بکاتـەوە. ئەو کاتە (فانگ کسوان) ئامۆژگاری (مـونگ) ی کـرد، کـە داوا لـە فـەرمانڕەوا بکـا بارەگـای شانـشینو خزمـانی بـۆ (کـسو) بگوازێتـەوە، کـە ئـەمـە جێبـەجێ بـوو، ئەوجارە (فانگ کسوان) بە (مونگ)ی گوت:

– ئێـستا هــەر سـێ کونەکـە ئامــادەن، دەتــوانی سـەرینەکەت دابنێـیو بـە سەلامەتی لێی بنووی.

لەگەڵ مانەوەی (فـانگ کـسوان) بـۆ ئامۆژگارییـەکانی، (مـنگ چـانگجون) وەك سەرۆك وەزیرانی (کی) بۆ ماوەی چەند دەیەیەك بە بێ مەترسی مایەوە.

لەوەبـەدوا، دەربڕینــی (**کەروێـشکە فێڵبازەکـە سـێ کـونو لانـەی هـەن**) بـۆ ئاماژەدان بە کەسێك کە ئامادە بـێ کارێـك بکـا. هـەروەها دەربڕینـی (**بالیفەکـەت تەواو دانێو بە سەلامەتی بنـوو**) واتـە هـەموو شـتێك سـەلامەتو ئاسـوودەیە، بـە جۆرێك کابرا دەتوانێ دانیشێو پشتێندی لێ بکاتەوەو لێی پاڵداتـەوەو سـەرخەوێ بشکێنێ.

لە چەرخی بەهارو پایزاندا، فەرمانڕەوای ویلایەتی (چین) فەرمانی دەرکرد کە بالاخانەیەکی نۆ نهۆمی دروست بکەن، تا ببێتە شوێنێکی ئاسوودەیی و خەمڕەوێنی. سێ سالان خەریکی ئەو باڵەخانەیە بوون، بەلام هەر تەواو نەبوو، ئەمە بووە هۆی بەهەدەردانێکی زۆری هێزی کارو سەروەت و سامان لەو ویلایەتەدا. بەلام فەرمانڕەوا دەیگوت:

– هەرکەسێ لەوبارەوە ئەگەر پیاوەو دەوێرێ نەیاری بکا، بزانە چۆن لە سێدارە دەدرێ!

کە ئەوەیان بیست، (کسون کسی) داوای لە یەکێك لە دەشتەکییەکانی دەوروبەری (جین) کرد، بچێتە دیدەنی فەرمانڕەوا. فەرمانڕەواش بە تووڕەییەوە رازی بوو دیدەنیان لەگەڵ بکا. لەسەر تەختی دەسەلات، تیرو کەوان لەنێو دەستی، دانیشتبوو. (کسون کسی) گوتی:

– ناوێرم بۆ گۆڕینی رایەکەت، باوەڕ بە بەڕێزت بێنم، بەلام دەمەوێ بڕوانی کە چۆن دەتوانم دوازدە پارچە شەترەنجان لەسەر یەکتر کەڵەکە بکەم و پاشان نۆ هێلکانیش یەك لەسەر یەك دابنێم؟

فەرمانڕەوا گوتی:

– دەی باشە نیشانم بدە.

ئەویش خۆی توندو بەندو رەق کردو دەمارەکانی گرژ کردن و ئاگاداری خۆی بوو. وەك بەڵێنی دابوو، پارچە شەترەنجەکانی لەسەر یەك کەڵەکە کردن. پاشان نۆ هێلکەشی لەسەریەك دانا. هەموو ئامادەبووان هەناسەی خۆیان راگرتبوو، فەرمانڕەوا هێند تووڕە بووبوو دەستی بە خنکەخنك کردو خەریك بوو بخنکێ. بەسەرسوڕمانەوە گوتی:

– ئەمە زۆر فشۆڵە و ئەو ترەکەڵەکە سەرناگرێ.

(کسۆن کی) یش وەلامی دایەوە:

–نا، فشۆڵ نییە، زۆر کەس لەمەش فشۆڵترن.

(کسۆن کی) زیاتری هەڵدایێ:

– هەتا ئێستا سێ ساڵمان پێ چوو، بۆ ئەوەی باڵەخانەیەکی نۆ نهۆمی بۆ جەنابت دروست بکەین، هێشتاش هەر تەواو نەبووە. پیاوەکان لە کشتوکاڵو لە ژنو لە جۆلاکانیان دابڕاون، بەروبوومی مرۆڤایەتیو ماڵی، لەسەر ئەم حاڵە هەمووی فەوتا. ویلایەتی هاوسێمان ئامادەیە سوود لە لاوازی ئێمە وەربگرێو پەلامارمان بداو ویلایەتەکەمان لەناو ببا. ئاخر چ شتێك هەیە لەمە فشۆڵتر؟!!

فەرمانڕەوا بە خراپی هەڵسوکەوتەکەی خۆی زانیو رەخنەی لە خۆ گرتو فەرمانی دا کە کاری باڵاخانەکە رابگرن.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**فشۆڵ وەك کەلەکەبوونی هێلکە**) مانای رەوشێکی زۆر مەترسیدار دەگەیەنێ.

(٢٠)

# سەرەتا لووتبەرزو دواتر بەڕێز



لە چەرخی ویلایەتە شەڕاوییەکان، کابرایەك هەبوو ناوی (سوکوین) بوو، ئەو کابرایە لە (لویانگ) دادەنیشت، زۆری هەوڵ دەدا تا ببێتە راوێژکاری فەرمانڕەوای چەند ویلایەتێك، بەڵام سەری نەگرت. بۆیە بە دڵتەنگییەوە رووەو ماڵ بوویەوەو هەستی کرد لە ماڵەوەش بە ساردی لەگەڵی دەجولێنەوە، وەك ئەوەی هەر خەڵکی ئەو ماڵە نەبێ. ژنەکەی لەبەردەم دەزگای جۆلاّیی دانیشتبوو، قەت بلێی هەڵنەستا سلاّوێکیشی لێ بکا، نەك هەر ئەمە، خوشکە ژنەکەشی خواردنی بۆ ئامادە نەکردبوو. لەبەرهەندێ (سوکین) هەستی کرد کە سووكو ریسوا بووە، خۆی لە ژوورەکەی زیندان کردو هەر بە کتێبانەوە خەریك بوو.

دوای ساڵێك، سەفەرێکی دەست پێکرد، تا کارێکی تازە بدۆزێتەوە. ئەمجارە توانی فەرمانڕەوایانی شەش ویلایەت رازی بکا کە هاوپەیمانێتی لەگەڵ یەکتر ببەستن لە دژی ویلایەتی دوژمنو بەتێنی (کین)، ئەمیشیان کردە سەرۆك وەزیرانی هەر شەش ویلایەت.

بەم هەموو پلەو پایەوە گەڕایەوە ماڵ، کە لە ماڵەوە زانیان نزیك ماڵ دەبێتەوە، ماڵیان پاك کردەوەو رێگای کن ماڵیان تەختو خۆش کردو شەرابو کوپو سەرقاپیان ئامادەکردو نزیکەی ٣٠ لی بە مۆسیقا لێدانەوە لە شار دەرچوون، تا پێشوازی لێ بکەن. ژنەکەی نەیدەوێرا رووی تێ بکا، بەلاّم خوشکە ژنەکەی بە خشە خش بۆ دەستو پێیانی چووو چەند جارێك بۆ داوای لێبوردن لەو کارانەی پێشووی، کرنووشی بۆ برد.

(سوکوین) یش زەردەخەنەیەکی هاتێو لێی پرسی:

—ئەرێ خێرە تۆ پێشتر هێندە لەخۆبایی بوویو ئێستاش هێندە خۆبەکەم زانی؟

وەڵامی دایەوە:

–چونکە ئێستا تۆ لە پلەو پایەیەکی بەرزیو خاوەنی سەروەتو سامانێکی گەورەی.

(سوکوین) هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

– ئێستاش من هەمان ئەو کەسەی جارانم، دوای ئەوەی ئێستا دەوڵەمەندبوومەو لە پلەوپایەیەکی بەرزدام، کەسو کارەکەم شانازیم پێوەدەکەن. بەڵام کە دەست کورتو نەدارو خۆبەکەم زان بووم، خۆیان لێ دەشاردمەوە. ئەگەر ئەوانە لە گۆشتو خوێنی منن، ئاوەها بن، ئەدی خەڵکی تر چی لێ چاوەڕوێ دەکری؟

لەوەبەدوا دەربڕینی (**سەرەتا لووتبەرزو دواتر بەڕێز**) ئاماژەیە بۆ ئاسانی هەڵوێست گۆڕینی کەسەکان، بە گوێرەی سەروەتو سامانیان بەرامبەر خەڵکانی تر.

## (٢١)

# ئەو تەڵەیەی بۆ خەڵکی تری دانابوویەوە خۆی پێوەبوو



(کسیاو من کین)ی میرزادە، (گۆنگسۆن یـانگ،٣٩٠–٣٣٨پ. ز)ی لـە ویلایـەتی (وی) بە سەرۆك وەزیران دامەزراند. (گۆنگسۆن یانگ) یارمـەتی فەرمانڕەواکـەی دەدا بۆ چاککردنی یاساکانو گـۆڕینی نەریتـە کۆنـەکان لـە (کـین) دا. بـە جۆرێك (کین) بەهێزبوو و گەشایەوە. بۆیە بۆ پاداشتی ئەو خزمەتانەی، قەڵای شـانگ–ی پێشکەش کردو ناوی لێنا (شانگ یانگ). بەڵام لە هەمان کاتدا (یانگ) دوژمنایەتی جێنشینو هەندێ لە کاربەدەستانی دەکرد، بۆیە دوای مردنی میرزادە (کسیاو مـن کین)، دوژمنەکانی شانگ یانگ تۆمەتی خیانەتیان پـێ هەڵبەسـتو ناچاریان کـرد کـە لـەوێ ڕابکـا. (یـانگ) ویـستی لـە هـۆتێلێکی بـچوکی نزیـك سـنووری وڵات بمێنێتەوە، بەڵام خاوەنی هۆتێل نەیهێشتو گوتی:

–شانگ یانگ چەند یاسایەکی داناون، ئەگەر خاوەن هۆتێلەکان کەسێك رابگرن ناسنامەی پێ نەبێت، ئەوا سزای خاوەن هۆتێلەکە دەدات.

دیسان (یـانگ) ناچـار کـرا کـە لـەو چـۆلەوارییە رابکـاو ئـاخیری هـەر گرتیـانو سەریان پەل دا.

بەم شێوەیە، شانگ یانگ، لەبـەر ئـەو یاسـایانەی کـە خـۆی داینـابوون، خـۆی فەوتاند. دەربڕینی (ئەو تەڵەیەی کە بۆ خەڵکی تری دانابوو، خـۆی پێوەبـوو) بـۆ وەسفی ئەو کەسانە بەکاردێ، کە دەبنە قوربانی ئەو نەخشەو پلانانەی کـە خـۆی داینـاون.

لە چەرخی ویلایەتە شەڕکەرەکان، (زی چۆ)ی کوڕی جێنشینی ویلایەتی (کین) وەك بارمتەیەك نێردرایە (هاندان)ی پایتەختی (زاو)، بەزۆری کە (کین) پەلاماری بردبا سەر (زاو)، (زی چۆ) لە حاڵێکی زۆر شڕو خراپدا دەبوو.

بازرگانێکی دەوڵەمەند هەبوو، ناوی (لۆبوی) بوو، ئەو بازرگانە بیری کردەوە، کە (زی چۆ) شاکارێکی دەگمەنەو شیاوی بایەخ پێدانە، بۆیە (زی چۆ)ی بردەماڵو پێی گوت، کە باوکی بەم زوانە دەگاتە سەر تەختی دەسەڵاتو ئەویش دەبێتە جێنشینی، بەڵام بەو مەرجەی ئەگەر توانی خانم (هوایانگ)ی دلبەرەکەی باوکی، کە تا ئێستا وەجاغ کوێرە رازی بکا، (چونکە دایکی **زی چۆ** لەلای باوکی فەرامۆش کراوە)، دوای ئەمە (لۆبۆی) یارمەتی (زی چۆ)ی دا بۆ هەڵاتنو گەڕانەوە بۆ (کین)و ئەم کارەش خانم (هۆیانگ) خستیە ئەستۆی خۆی.

دوای ماوەیەکی کەم، باوکی گەیشتە سەر تەختو (زی چۆ)ی کردە جێنشین، دوای ساڵێك، کە باوکی مرد، (زی چۆ) خۆی چووە سەر تەختی (کین)و (لۆبۆی) کردە سەرۆك وەزیران.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**شاکارێکی دەگمەنەو شیاوە بۆ بەهەند هەڵگرتن**) بۆ سوود وەرگرتن لە هەندێ هەڵکەوتی باش بۆ بەدەستهێنانی پلەو پایەی گەورە بەکاردێت.

(٢٣)

# فەرمانی دا کە میوانەکان دەربکرێن



پێش ئەوەی یەکەمین ئیمپراتۆری کین (٢٥٩– ٢١٠پ. ن) لە چین دابمەزرێ. لی سی (؟–٢٠٨پ. ن) کە لە دانیشتوانی ویلایەتی (چۆ) بوو، بڕیاری دا بچێتە ویلایەتی (کین) کە خۆی فەرمانبەرێکی گەورەی دەرباری پادشایەتی بوو. ئەنجا دواتر، ویلایەتی (هان) پیاوێکی بەناوی (زنگ گۆ) بۆ (کین) نارد تا باوەڕ بە فەرمانڕەواکەی بێنێ کە جۆگایەکی ئاودێری دروست بکا، مەبەستی راستەقینەی (هان) ئەوەبوو، کە (کین) سوود لە دەرامەتی مرۆڤیو داراییەکانی ئەو پرۆژە وەربگرێ، چونکە ماوەیەکە (هان) لەبەر داگیرکاری حاڵی شڕە.

فەرمانڕەوای (کین) بووە قوربانی ئەو فڕوفێڵەو جۆگایەکی دروست کردو ناوی نا جۆگای (زنگگۆ)، دواتر رووی راستی نیازەکەی دەرکەوتو راوێژکارەکان فەرمانڕەوایان هاندا کە هەموو فەرمانبەرە بێگانەکان وەدەرێ بنێ.

(لی سی) یش لەنێوان ئەو کەسە دەرکراوانەدا بوو، بۆیە داوای بەخشینی لە پاشا کرد کە بەزەیی پێدا بێتەوەو بۆی روون کردەوە کە دەرکردنی هەموو فەرمانبەرە بیانییەکان لە بەرژەوەندی (کین) دا نییە.

سەرەنجام، فەرمانڕەوای (کین) بڕیارەکەی خۆی هەڵوەشاندەوەو (لی سی)ش لە (کین) مایەوەو بووە سەرۆك وەزیران، پاشان یارمەتی (کین)ی دا بۆ ئاوەدانکردنەوەی هەموو وڵات.

لەوە بەدوا، دەربڕینی(ئەمری کرد کە میوانەکان دەربکرێن) بۆ داوای رۆیشتن لە میوان بەکاردەهێنرێ.

## (٢٤)

# وشەیەك یەكسانە بە هەزار پارچە زێڕ



کە (لوبوی) سەرۆك وەزیرانی ویلایەتی (کین) بوو، نزیکەی سێ هەزار بیرمەندی بۆ ناوبانگ زیادبوونی خۆیو مانەوەی تا نەوەکانی داهاتوو، لە دەوری خۆی کۆکردبووەوە.

(لوبوی) فەرمانی بەو بیرمەندانە کرد، هەرچی دەیزانن بینووسنەوە. وابوو هەموونووسینەکانیان لە یەك کتێب کۆکرانەوەو بەناوی (تۆمارەکانی لو) ناونران.

دوای تەواوبوونی، (لوبوی) کتێبەکەی لە سەر دەرگای بازاڕی (کسیانیانگ) کە دواتر بووە پایتەختی (کین)، لەگەڵ هەزار (یی) لە زێڕ هەڵواسیو ئەم دەستەواژەی خوارەوەشی لەگەڵدا پەیوەست کرد:

**(هەرکەسێك ئەگەر توانی وشەیەك بۆ ئەم کتێبە زیاد بکات یان لایببات، ئەوا پاداشتەکەی بە زێڕ دەدرێتەوە.)**

کەس نەوێرا داوای ئەو پاداشتە بکا، چونکە (لوبوی) بە کابرایەکی ئازاو رەشید ناسرابوو.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (وشەیەك یەکسانە بە هەزار پارچە زێڕ) بۆ پەسنی پارچەیەکی ئەدەبیی گرنگو نایاب بەکاردەهێنرێ.

## (٢٥)

# چۆن (سنۆنۆ) بە هیوایەتەکانی قوڵنگ دەزانێ؟



ئەوکاتەی چن چانگ (؟– ٢٠٨پ. ن) لە هەرەتی گەنجی دابوو، وەك کرێکارێك لەو زەوییانەدا کاری دەکرد.

جارێکیان جووتکردنەکەی راگرتو لەسەر تەپۆلکەیەك راوەستاو بۆ ماوەیەکی زۆر لە حاڵێکی شڕ دابوو، پاشان بە برادەرەکانی خۆی گوت:

–ئەگەر لە داهاتوودا هەریەکێك لە ئێمە دەوڵەمەندو ناودار بوو، هەق وایە ئەوانی تر لەبیر نەکا ! !

هاوڕێیەکانی پێی پێکەنینو گوتیان:

– پف ! ئەتۆ تەنیا کرێچییەکیو بەس، ئاخر چۆن دەوڵەمەند دەبیت؟

(چن چانگ) یش هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

–ئاخ ! سنۆنۆ چۆن بە هیوایەتەکانی قولنگ دەزانێ؟

دوای ئەمە (چان چانگ) کودەتایەکی بەسەر دەسەلآتی بەرەبابی (کین) کردو بووە پاشا.

بەوجۆرە، دەربڕینی ( **چۆن سنۆنۆ بە هیوایەتەکانی قولنگ دەزانێ؟**) وەك توانج بۆ ئەو کەسە سادانەی، کە ناتوانن لە خاوەن هیوایەتە گەورەکان تێ بگەن، بەکاردەهێنرێ.

سـالّی ٢٦٠ی پ. ز، یەکـەمین ئیمپراتـۆری (کـین) لـە سـالّی کۆتـایی فەرمانڕەوایەتییەکەی و لە کاتی بەسەر کردنەوەیەکی (گـۆجی) دا، لـە رووبـاری (زی) پەڕییەوە.

کزیانگ یو (٢٣٢–٢٠٢پ. ز)، لەگەڵ (کەزیانگ یانگ)ی مامی بۆ بینینی ئەم دیمەنە رۆیشتنە ئەوێ.

(کزیانگ یو) گوتی:

– دەرکردنو جێگرتنی ئاسانە.

(کزیانگ لیانگ) یەکسەر بێدەنگی کردو پێی گوت:

– ئەو قسانە مەکە، ئەگەر نا ئێمە ژیانی هەر یەکێك لە خێزانەکانمان لە ئەستۆ دەبێ!

بەڵام لەو کاتەوە کزیانگ لیانگ، کزیانگ یوی بە کەسێکی زۆرباش حسێب کردووە. لەوەبەدوا، کزیانگ یو بووە سەرکردەی هێزە یاخیبووەکان، کە دەسەڵاتی بنەماڵەی (کین)ی لەناوبرد.

بەم جۆرە، ئەم دەربڕینە بۆ سەرکەوتن بەسەر کەسێكو جێگاگرتنەوەی بەکاردێت.

## (٢٧)

# با سەرفەتاح[1] بە لێدان بێت



[1] سەرفەتاح: واتە یەکەم دەستپێشخەری

لە ساڵی ٢٠٩ی پ. ز، شۆڕش لە دژی بەرەبابی (کین) ی فەرمانڕەوا هەموو شوێنێکی گرتبووەوە، قازیی دەڤەری (گۆیجی) بۆ وەرگرتنی رای (کزیانگ لیانگ)، چووە لایو پێی گوت:

– ئەو کەسەی یەکەم جار دەست بە لێدان بکا، دەستپێشخەرییەکەی دەستکەوتووە، ئەو کەسەی لە لێدان دوابکەوێ، ئەوا سەرشۆڕ دەبێ. بۆیە داوات لێدەکەم بۆ ئەم شۆڕشە یەکسەر بەگەڵم بکەوی.

(کزیانگ یانگ) وای دەرخست کە رازییە. پاشان برازاکەی (کزیانگ یانگ)ی نارد تا قازیو یاریدەدەرانی کە ژمارەیان لە سەد زیاتر بوو سەرببڕێ. بەو شێوەیە، خەڵکی ناوچەی (گۆیچی) لە دەوری (کزیانگ لیانگ) خڕبوونەوەو بۆ لەناوبردنی تایەفەی دەسەڵاتداری (کین) پشتیوانییان کرد.

لەوەبەدوا، دەربڕینی دەستپێشخەرییەکە سەرفەتاح بە لێدان دەست پێ بکە، ئاماژەیە بۆ ئەو کەسەی یەکەم جار هەڵسوکەوت دەکاو لای ئەوانی تر سەرشۆڕ دەبێ.

ئیمپراتۆری دووەمین کە لە بنەماڵەی (کین) بوو، لە ساڵی ٢٠٩ی پ. ز، هاتە سەر تەختی شانشینی. بنەماڵەی فەرمانڕەوا لە قۆناغێکی دواکەوتوویی دابوو، هەرچی وڵاتیش بوو هەمووی لەبارێکی یاخیبوون دا بوو.

لیوبانگ (٢٥٦– ١٩٥پ. ز)، کە دواتر بنەماڵەی فەرمانڕەوای (هان)ی دروست کرد، لەگەڵ سەد پیاوی دەوری خۆی دانیشتو پەیامێکی بۆ هاوڵاتیانی هەرێمی (بای) رەوان کردو تیایدا گوتبووی:

– هەموو نەتەوەیەك بەرهەڵستکاری دەسەڵاتی بنەماڵەی کینەو شۆڕشیش لە هەموو جێیەك هەڵدەستێ، ئێستا تەنیا شۆڕش دەتوانێ رزگارتان بکا.

بەو جۆرە، خەڵکی (بای) فەرمانڕەوای خۆیان کوشتو دەرگای شاریان لەسەر (لیوبانگ) خستە سەر پشتو ویستیان بیکەنە فەرمانڕەوای خۆیان. بەڵام (لیوبانگ) پێی گوتن:

– ئەگەر ئەوکەسەی هەڵیدەبژێرن شیاو نەبوو، ئێوە دەدۆڕێن، ئەو کاتە هەموو شتێك بەرەو هەڵدێر دەچێ. من توانایەکی لەرادەبەدەرم نییە، بۆیە تکا دەکەم کەسێکی دیکە دەستنیشان بکەن.

بەڵام خەڵك بینیان کە (لیوبانگ) بۆ ئەم کارە شیاوترین کەسایەتییە، بۆیە کردیانە فەرمانڕەوای (بای).

لە دواییدا، دەستەواژەی (**ئەو دۆڕانەی کە هەموو شتێکی تێكو پێك شکاند**) بۆ وەسفی بەزینێکی تەواوی تێكو پێك شکێنراو بەکاردێت.

زانگ لیانگ (؟– ١٨٦پ. ز) هێشتا هەر مندالْ بوو، جارێکیان بۆ گەشتو سەیران چووبووە سەر پردی (کسیابی)، لەوێ پیرەمێردێکی بینی پێڵاوەکانی لەسەر پردەکە هاویشتە خوارێ، پیرەمێردەکە بە (زانگ لیانگ)ی گوت:

– هۆ کوریژگە ! هەڕوو ئەو پێڵاوانەم بۆ بێنەوە.

(زانگ لیانگ) واقی وڕمابوو ویستی شتێکی بخێوێنتیێو لێی بدا. بەلاَم لەبەر بەساڵاچوونی پیرەمێردەکە سڵەمییەوە. (زانگ لیانگ) چوو پێڵاوەکانی هێنانو پیرەمێردیش پێی درێژ کردو گوتی:

– دەی دە پێم بکە !

(زانگ لیانگ)یش پێڵاوەکانی دەپێی پیاوەکە کرد، پیرەمێرد دوورکەوتەوەو دەستی بە پێکەنین کردو پاشان سەری خۆی باداو گوتی:

– کوڕە لاو ئەتۆ شایانی فێرکردنی، لە سەرو حەدی بەیانیان تا پێنج رۆژان لێرە بمبینە.

(زانگ لیانگ) دوو جاران هاتە ئەوێو بەلاَم پیرەمێرد لەپێش ئەو نوێژی دەکردو پەشیمانی لەبارەی دواکەوتنەکەی دەردەبڕی. دوای ئەمە، (زانگ لیانگ) لە نیوەی شەوێدا رۆیشتە لای پردەکە، پیرەمێردەکە بە درەنگەوە گەیشتو گوتی: (ئاووەتە، پێویستە ئاوها بیت) و کتێبێکی دایە زانگ لیانگو پێی گوت:

– ئەم کتێبە بخوێنەوە، ئەنجا دەبی بە مامۆستای پاشاو ئیمپراتۆڕەکان..

(زانگ لیانگ)یش کتێبەکەی وەرگرت، کە بە ناوونیشانی (هونەری جەنگی گەورە سەرکردە) بوو، دوای ئەمە زانگ لیانگ یارمەتی (لیوبانگ)ی دا بۆ پێکهێنانی بەرەبابی دەسەڵاتداری (هان)و بووە فەرمانڕەوای (لیو).

بەم جۆرە، دەربڕینی (کوڕە شایانی فێرکردنە) بۆ ستایشی گەنجە خاوەن بەڵێنەکان، بەکاردێت.

## (٣٠)

# چاودێری کردنی شەڕ لە مەتەرێزەوە



لە ساڵی ٢١١ی پ. ز، ئەوکاتـەی لەشـکری شۆڕشـگێڕی (کسیانگ یـو) لەگـەڵ هێـزی ئیمپراتـۆر (جولـو)ی (کـین) دەجـەنگا، کۆمـەڵێك تیپـی تـری شۆڕشـگێری گەیشتنە ئەویّ، بەڵام لە هێزی (کین) ترسانو نەیانوێرا بچنە گەڵ (کسیانگ یـو). زۆر بـە سـادەو سـاکاری لەسـەر مەتـەرێزی شـوورەکان دەوەسـتانو چاوەدێری شەڕەکەیان دەکرد، ئەگەرچی ژمارەی پیـاوانی (کسیانگ یـو) یـەك بـە دە لـەوان کەمتر بوون، بەڵام زۆر بە ئازاو دلێری دەجەنگان، دەنگیان دەگەیشتە سـەرتاپای زەوی، ئەوانـەی چـاوەدێری شـەڕەکەیان دەکـرد واقیـان وڕمـا بـو، لـە کۆتاییـشدا لەشـکری (کـین) شـکاو (کسیانگ یـو) بـووە بـەهێزترین پیـاوی ئیمپراتۆرییەکـە. ژەنەڕاڵە شۆڕشـگێڕەکان دەهاتنـە سـەردانی (کسیانگ یـو)، سـەریان لەبەرامبـەر دادەنەواندو زاتیان نەدەکرد راستەوخۆ لە چاوی بڕوانن.

دوای ئەمە (کسیانگ یو) هەموو سەرکردەکانی سـوپای دژ بـە (کـین)ی بـەدیل گرتن.

بەم شێوەیە، دەربڕینی (**چاودێری کردنی شەڕ لە مەتـەرێزەوە**) بـۆ ئامـاژەدان بە خۆرزگارکردن، بیّ بەشداری کردن لە ناکۆکیی خەڵکانی تر، بەکاردەهێنرێت.

هان کسین (؟– ١٩٦پ. ز) ئەفسەرێکی بچکۆڵەی سوپای (کسیانگ یو) بوو. هێشتا پلەدارییەکەی تەواو نەبووبوو، سوپای بەجێ هێشت‌و چووە پاڵ سوپای (لیوبانگ)، ئەو سوپایەی کە لەگەڵ سوپای (کسیانگ یو) حەزیان بە چەهرەی یەکتر نەدەهات. جارێکی دیکە وێڕای ئامۆژگاری یەکێك لە گەورە یاریدەدەرەکانی لیوبانگ کە ناوی (کسیاوهی) بوو. (هان کسین) لە دەسکەوتی پلەو پایە شکستی هێنا، بۆیە دەستی لەکارکێشایەوە. کە (کسیاوهی) بەمەی زانی داوای لێکۆڵینەوەو جارێکی تر گەڕانەوەی کرد. (کسیاوهی) بە (لیوبانگ)ی راگەیاند، کە ئەگەر دەیەوێ هەموو وڵات بخاتە بن دەستی خۆی، پێویستە فەرمانڕەوایی سوپا بداتە دەست (هان کسین)، کە (لیوبانگ) زانی (کسیاوهی) زۆر رێزی (هان کسین)ی لایە، هەڵوێستی خۆی گۆڕی‌و لە ئاهەنگێکی شکۆداردا (هان کسین)ی کردە فەرمانڕەوای باڵا.

لەو شەڕەی دواییدا، کە بۆ یەکگرتنەوەی هەموو وڵات لە دژی کسیانگ یو تەواو ببوو، (هان کسین) بەسەر ئەوانی تر سەرکەوت‌و چەند هەنگاوێکی گرنگی بۆ دامەزراندنی زنجیرەی دەسەڵاتداری (هان) بەدەست هێنا. دوای ئەمە (لیوبانگ) ترسا لەوەی کە (هان کسین) کودەتایەکی لە دژ ئەنجام بدا، چەند جارێك وازی هێنا، بەڵام ئەو هەر لە پایتەخت مایەوە.

لە ساڵی ١٩٦ی پ. ز، ئەو کاتەی لیوبانگ لە دەرەوەی وڵات بوو، (هان کسین) بە دەرفەتی زانی‌و لەگەڵ ژەنەڕاڵێکی تر کودەتایەکی ئەنجام دا، (کسیاوهی) لەگەڵ خانمە ئیمپراتۆر (لوزی)، پلانێکی داڕشت، کە (هان کسین) هەڵخەڵەتێنن‌و بینێرنە کۆشك، لەوێش بیگرن‌و لە سێدارەی بدەن.

بەوشێوەیە، هان کسین لەسەردەستی (کسیاوهی) لە سێدارەدرا.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**بردنەوەو دۆڕان لەسەردەستی کسیاوهی**) بۆ ئاماژەدانە بە بردنەوەو دۆڕاندن لە خودی کەسەکەدا.

(هان کسین) لە ساڵی ۲۰۳ی پ. ز، دا بووە پاشای (کی)، دوای ئەوەی لە لایەن (لیوبانگ)ی یەکەم ئیمپراتۆری زنجیرەی (هان) داندرا، (کوای تۆنگ)ی راوێژکاری، پێشنیارێکی کرد، کە پەیوەندی لەگەڵ (لیوبانگ) بپچڕێنیّو ئیمپراتۆرییەت لە نێوان پاشایان (هان) و(چۆ)دا دابەش بکات، بەڵام (هان کسین) بەم پێشنیارە رازی نەبوو.

لە ساڵی ۱۹٦پ. ز، بە تۆمەتی پیلانگێڕی بۆ کودەتا، (هان کسین)یان لە سێدارە دا. (لیو بانگ) گویّ بیست بووبوو کە (کوای تۆنگ)، (هان کسین)ی لەسەر کودەتاکە هانداوە، بۆیە فەرمانی دەستگیرکردنی (کوای تۆنگ)ی داو داوای کرد بیهێنن لە پایتەخت لە داری بدەن.

(کوای تۆنگ) بە (لیوبانگ)ی گوت:

– کە زنجیرەی (کین) ئاسکەکەی خۆی فەوتاند، هەموو ولاتەکان هەوڵیاندا دەستی بەسەردا بگرن، بەلام ئەوە تەنیا کەسی بە تواناو بەسەلیقەیە کە دەرفەتی لێکۆڵینەوەی لەم بارەوە هەبیّ. سەگ بە خەڵك دەوەڕیّ، لەبەرئەوەنا کە خەڵك خراپە، بەڵکو لەبەرئەوە ئەوان گەورەی ئەم نین. لەم کاتەدا، زانیم کە ئەرکی من تەنیا ئەوەیە یارمەتی (هان کسین) بدەمو هێزی بۆ پەیدا بکەم. ئەو کاتیش من شکۆو مەزنی تۆم نەدەناسی. لەبەرئەوە لەداردانی من دادپەروەرانە نییە.

بەم شێوەیە لیوبانگ ئەوی بەخشی.

لەوەوپاش، دەربڕینی (**راوی مامزان لە نیمچە دەشتاییدا**) بۆ وەسفی شەڕکردن لەسەر هەبوونی هێز بەکاردەهێنریّ، لە دەربڕینێکی تریش کە دەڵیّ: **مامزکوژ ناناسریّ**، ئاماژەدانە بەوەی کە ئەنجامی ململانیّو چاو لێك سوورکردنەوە، قەت یەکلانابێتەوە.

(٣٣)

# رێککەوتن لەسەر یاسای سێ خاڵەکە



لە ساڵی ٢٠٦ی پ. ز، (زی سینگ)ی ئیمپراتۆڕی زنجیرەی فەرمانڕەوای (کین)، خۆی رادەستی (لیوبانگ) کرد، کە لیوبانگیش چووە ناو (کسیانیانگ)ی پایتەختی کین، سەرنجی دا کە کۆشکی ئیمپراتۆڕی شوێنێکی گەلێك خۆشەو پڕە لە گەنجینەو پڕە لەئافرەتی جوانو نازدار. ویستی لەوێ بسەنگرێتەوە، بەلاّم (زانگ لیانگ) و (فان کوای) هەردوو راوێژکارەکانی باوەڕیان پێهێنا کە خۆی تووشی ئەو چێژو رابواردنە نەکا، ئەگەر نا دڵسۆزی گەلەکەی لە دەست دەدا.

بەم شێوەیە، لیوبانگ بۆ مانەوە، هاتەوە کن سوپاکەی‌و، ریش سپی‌و پیاوماقولاّنی گەڕەکەکانی کۆکردەوەو پێی گوتن:

– لەمێژە هەمووتان لە دەست ستەمکاریی (کین) دادە دادتانە، من ئێستا لێرەم تا (گوانزۆنگ و ها) دادگایی بکەم‌و یاسایەکی سێیینەتان بۆ دادەنێم. هەر کەسێك بکوژ بێ لە دار دەدرێ، هەرکەسێك ئازاری خەڵك بدات، سزا دەدرێ. هەرکەسێکیش دزی بکات دادگایی دەکرێ. جگە لەو سێ یاسایە هەر یاسایەکی دیکەی چین پووچەڵن.

پاشان داوای لە پیاوماقولاّن کرد، دەنگوباسی ئەو یاسایە نوێیە بلاّو بکەنەوە.

بەم رێگایە، (لیوبانگ) بەدڵسۆزیی گەلی (کین) سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**رێککەوتن لەسەر یاسای سێ خاڵی**) ستایشی یاساو بنچینەیەکی روون‌و کورت‌و سەرپێی دەکات.

## (٣٤)

# زیافەتو سەمای شمشێران لە هۆنگمان



ئەو کاتەی (لیوبانگ) چووە ناوچەی (گوانزونگ) لە کەرتی (شانکسی) ئێستا، سوپاکەی کە سەد هەزار کەس دەبوو، لە (باشانگ) راگرت، لەوێ خۆی بینییەوە کە رووبەڕووی سوپای (کسیانگ یو) دەبێتەوەو ژمارەیان چوارسەد هەزار کەس دەبێ‌و لە هۆنگمان‌و نزیکەی چل (لی) لێیانەوە دوورن.

کە (کسیانگ یو) ئامادەبوو تا هێرشێکی فراوان بکاتە سەر دوژمنەکانی، (کسیانگ بو)ی مامی بەمەی زانی‌و بە نهێنی خۆی گەیاندە نێو سەربازگەی (لیوبانگ)، تا (زانگ لیانگ)ی برادەری، لەو مەسەلەیە ئاگاداربکاتەوە، چونکە ئەو راوێژکاری هەرە لەپێشی (لیوبانگ) بووو ئەویش ئامۆژگاری کرد کە رابکا، بەڵام (زانگ لیانگ) ئەمەی رەت کردەوە، لە جێگای ئەمە (کسیانگ یو)ی بە مامۆستاکەی ناساند، (لیوبانگ)یش بە دیتنی (کسیانگ یو) زۆر خۆشحاڵ بووو داوای مۆرکردنی رێکەوتنی ئاشتەوایی لە نێوان خۆی‌و (کسیانگ یو) کرد، نەك هەر ئەمە بەڵکو کار گەیشتە ئەوەی بیریان کردەوە کە ژن‌و ژنخوازیش لەنێوان منداڵەکانی ئەوو منداڵەکانی (کسیانگ یو) پێك بێ.

لە رۆژی پاشی، لیوبانگ بە هاوڕێیەتی زانگ لیانگ‌و تەنیا سەد سوارەوە چووە (هۆنگمان)، لە زیافەتێکدا کە ئەو ئێوارەیە رێك خرابوو، (فان زنگ)ی راوێژکاری باڵای (کسیانگ یو)، سێ جاران مامۆستاکەی هان دا کە سوود لەو دەرفەتە وەربگرێ‌و (لیوبانگ) لە کۆڵ بکاتەوەو بیکوژێ، بەڵام سەری نەگرت. دوای ئەمە (فان زانگ) لە دوای (کسیانگ چوانگ)ی ناردو داوای لێکرد هەستێ سەما بە شمشێر بکاو دەرفەتێك وەربگرێ‌و لەسەری (لیوبانگ) بدا. بەڵام کە کابرا سەمای شمشێری دەست پێکرد، (کسیانگ یو) هەستی بە نیازخراپی‌و ناپاکی کردو

شمشێرەکەی هەڵگرتەوەو لەگەڵ ئەوان سەمای کرد، تا (لیوبانگ) لە ئازارو مەینەت بپارێزێ.

پاش ئەمە، (لیوبانگ) داوای بوردنی لە بەجێهێشتنی زیافەتەکە کردو تێی تەقاندو هەڵات.

بەم شێوەیە، دەربڕینی **زیافەتو سەمای شمشێران لە هانگمان**، ئاماژەیە بۆ ئەو ئاهەنگەی کە بۆ ترساندنی مێوان، یان بۆ بەزۆر ملکەچکردنی ئامادەدەکرێ. هەرچی دەربڕینی (**سەمای شمشێری کسیانگ چوانگ**)ە، هەمان واتا دەبەخشێ، هەردوو دەربڕینەکە ئاماژەیە بۆ ئەو کارانەی لە رووکاردا دۆستایەتی نیشان دەدەن، بەڵام لە راستیدا کاری دوژمنکارانەن.

(٣٥)

# ئەوان چەقۆو تەختەقیمەن، ئێمەش ماسیو گۆشت



لە میانی زیافەتەکەی هۆنگمان، کە (لیوبانگ) دوای ئەوەی ئاگادارکرایەوە کە بۆ تیرۆرکردنی پلانێك دارێژراوە، خێوەتەکەی خۆی جێهێشتو (ڤان کوای)ی یاریدەدەری لەگەڵ خۆی بردو پێی گوت:

– ئیزنیشم لە خانەخوێ نەخواستووە، دەبێ هەر هەڵێم، بەڵام چۆن دەتوانم ئێرە جێبێڵم، خۆ ئابڕووم دەچێ؟

ڤان کوای وەڵامی دایەوە:

– پێویست ناکا بە هۆکارێکی هەرە گەورە، تەگەرەی تەواو دروست بێ. کسیانگ یوو راوێژکارەکانی چەقۆو تەختەقیمەن، ئێمەش ماسیو گۆشتین، باشە بۆچی هێندە پێداگرتن لەسەر زیافەتەکە؟

بەم شێوەیە، لەناکاوێك (لیوبانگ) لەگەڵ (ڤان کوای)و سێ پیاوی تر زیافەتەکەی جیهێشتو بە پێیان بۆ خێوەتگاکەی گەڕانەوە.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **(ئەوان چەقۆو تەختەقیمەنو ئێمەش ماسیو گۆشت)** بۆ وەسفی بوونێك لەبن رەحمەتی خەڵکانی تر بەکاردەهێنرێت.

لە ساڵی ٢٠٥ی پ. ز، (لیوبانگ) تاجی پاشایی خرایە سەرو بووە پاشای (هان)، بەڵام چونکە هێزە سەربازییەکەی (کسیانگ یو) دمك دمکانەو ململانێی لەگەڵ دەکردو تواناشی زۆر لە هی ئەو زیاتر بوو، بۆیە (لیوبانگ) ناچار بوو لەگەڵ سی هەزار لە پیاوەکانی بۆ ناو قەڵاکەی لە (هانزونگ) بکشێتەوە، ئەو قەڵایەش دەورە درابوو بە شاخو ئەو رێگایەی کە بۆی دەچوو، رێگایەك بوو بە تەختەدار دروست کرابووو لە تەلانی تاتە شاخێکدا بۆی دەچوو.

(لیوبانگ) ئەم رێگا تەختەدارەی سوتاندو پیاوەکانی بە سەلامەتی پەڕینەوە تا بیکەنە بەڵگە بۆ کسیانگ یو، کە نیازی گەڕانەوەی نییە تا نەیگاتێ، دوای نزیکەی شەش مانگ، لیوبانگ پیاوەکانی خۆی ناردەوە تا رێگاکە چاك بکەنەوە. (کسیانگ یو) گومانی ئەوەی برد کە ئەوان دەیانەوێ هێرشیان بکەنە سەر لەو رێگایەدا، ئەو هێرشەش ئەنجام نادرێ تا لەچاککردنەوەی رێگاکە نەبنەوە. لەم نێوانەدا (لیوبانگ) سەرکردایەتی هێزێکی نهێنی کرد بۆ (گوانزونگ)و لە رێرەوی ترسناکی (شنکانگ) پەڕینەوەو لە هیکەوە کە ئاگای لەخۆ نەبوو (کسیانگ یو)یان بەدیل گرت.

لەو کاتەوە، (لیوبانگ) و (کسیانگ یو) لەسەر ئەو دورگانەی ناوەڕاستی چین ململانێیتیان.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**چاککردنی رێگاو دروستکردنی سەرولێژێکی نهێنی**) بۆ کارێکی چاك بەکاردێ کە لە پشتەوەی فروفێڵو بینەو بەردە هەبێ.

(هان کسین) لە ساڵی ٢٠٥ی پ. ز سەرکردایەتی سوپایەکی زۆر گەورەی لە زنجیرەی (هان) ، لە دژی شانشینی سەرەوەی (زاو) لە بەشی رۆژئاوای کەرتی (هیبی) ی ئێستا گرتە ئەستۆ.

لەسەرەتادا چەند فەوجێکی نارد تا لە نزیك خێوەتگای سوپای (زاو) بۆسە دابنێنەوە، پاشان فەرمانی بە بەشێکی زۆری سوپاکەی کرد لە بەرامبەر خێوەتگای (زاو) جێگیر بن، بە جۆرێك رووبارەکە بکەوێتە دواوەیان.

سەربازانی (زاو)، بەم هەڵە تەکنیکییە زۆر پێکەنین، بەڵام لەگەڵ نەبوونی هیچ رێگایەك بۆ کشانەوە، لەبەرامبەر سوپای گەورەی (کسین) تەنیا شەڕێکی دەستەویەخە هەیەو دواتر بەسەر سوپای (زاو) سەردەکەون.

کە سەربازانی (زاو) بۆ خێوەتگاکانیان کشانەوە، تەماشایان کرد ئەوان وا کەوتوونەتە ناو بۆسەیەك، بەم شێوەیە سوپای (زاو) تێك شکا، دوای ئەوەی دەزگای سەربازی، هەڵوەشاوەو لەوێ کەوتو فەرماندەی ئەو سوپایە سەری بڕاو پاشای (زاو) بەدیل گیرا. لە میانی ئاهەنگو زیافەتی سەرکەوتن دا، یاریدەدەران لە (هان کسین) یان پرسی، بۆ تەکلیفت لە پیاوەکانی خۆت کرد کە بە ریز بوەستن، بەجۆرێك کە رووبارەکە بکەوێتە پشتیان، بەتایبەتی ئەمە پێچەوانەی هونەرەکانی شەڕە؟

هان کسین گوتی:

– لە حاڵی وەهادا پیاو بە ئازاییو دلێری شەڕ دەکا، چونکە مەحاڵە بتوانێ رابکا. زۆربەی سەربازەکانمان ئەوانەی لە سوپاکانی تر بوون خۆیان تەسلیم کرد، لە شوێنێك بوون مەحاڵ بوو بتوانن بکشێنەوە. بۆیە بە نەبەردی شەڕیان کرد. بەڵام ئەگەر لە شوێنێك بووبان توانای کشانەوەیان هەبا، دەکشانەوە.

لەوەبەدوا دەربڕینی **کوشتارو رووبار لەدواتە**، بۆ وەسفی هەوڵو کۆششی نەبەردانە بەکاردەهێنرێ.

دوای دانانی (هان کسین) بە فەرماندەی سوپا. بە (لیوبانگ)ی گوت:

– بۆ خزمەتی (کسیانگ یو) کەلوپەلم حازر کردوە، بۆیە ڕێگام بدە کە پێت ڕابگەیەنم کە دەبێ چ جۆرە پیاوێکی هەبن. کە (کسیانگ یو) گەورەیی ئەوی بۆ دەرکەوێ، هەمووپیاوەکان لە ترسان رادەچڵەکێن، بەڵام ئەو پێی ناپەسند بوو کە ئەفسەرە دیارو بەتواناکان دەسەڵاتیان پێ بدرێ، لەبەرئەوەی ئەم تەنیا ئازاییەتی پیاوێکی سەربزێوی هەیە، بەڵام تەبیعەتێکی بەڕێزو بەخشندەو خۆشەویستیی هەیە، ئەگەر کەسێك نەخۆش کەوت، بۆی دەگریێو خوانچەی خواردنێکی خۆشی بۆ دەنێرێو ئەگەر کابرایەك خزمەتێکی گرنگی پێشکەش بکات، دەبێ پاداشتەکەی بە نازناوو پلەو پایە بێ، و وای لێدەکا لە هەر کارێك کە هێزو تاقەتی لەسەر هەیە لاییبا، ئەمە بە چاکەی ژنانە ناسراوە.

هان کسین لەو دەرەنجامەدا بۆی دەرکەوت کە دەتوانێ (کسیانگ یو)بەهۆی سوود وەرگرتن لە بێهێزییەکەی، شکست پێ بێنێ.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **ئازایەتییەکی سەرگەرمو چاکەیەکی ژنانە**، بۆ جۆرەکانی ئازایەتیو بەخشندەیی بەکاردەهێنرێت، کە یارمەتی بەدەستهێنانی مەبەستێکی بنچینەیی لە چالاکییەکی دیاریکراودا نادا.

لـە سـاڵی ٢٠٢ی پ. ز، چـەند سـاڵێك تێپـەڕی بـوو بەسـەر جـەنگی نێـوان سوپای (هان) بە سەرکردایەتی (لیوبـانگ) لەگـەڵ سـوپای (چـۆ) بەسـەرکردایەتی (کسیانگ یو)، لەبەر هێرشە بەردەوامەکان، هەردوو لا کفت بووبوون، لەو قۆناغەدا لە ناوچەی (کسیانگیانگ) بەرەو رووی یەکتر بوون، سوپای (چۆ) ورە بەرز بـوون، بەڵام لەبەر بێ زادو خۆراکی دەیانناڵاند، لە بەرامبەریشدا سـوپای (هـان) ورەیـان کز ببووو زادو خۆراکێکی زۆرو زەبەندیشیان هەبوو.

(لیوبانگ) دوو نێردراوی ناردنـە لای (کـسیانگ یـو)، تـا رازی بکـا بـەوەی وڵات لەنێوان هەردوولادا دابەش بکەن، بـەجۆرێك ئـەو ناوچـانەی کەوتبوونـە رۆژهـەڵاتی (هۆنگۆ) ببنە هی (چۆ)و ئەوانەی رۆژئاوای (هۆنگۆ)ش بۆ (هان) بن.

(کسیانگ یو)ش باوکی (لیوبانگ)و ژنەکەیو رۆڵەکانی کـە دیـل بـوون لای ئـەو گەڕاندنیـەوەو دواتـر بـەرەو لای رۆژهـەڵات کـشایەوە، بەمـەش خۆشـییو شـادی خستە دەروونی پیاوەکانی، (لیوبانگیش) ئامادەبوو کە بکشێتەوە، بـەڵام هـەردوو راوێژکارەکانی (زانگ لیانگو چنگ بینگ) پێیان گوت:

– دوای ئـەوەی سـوپای (چـو) ئێـستا بـۆ دەسـکەوتنی خـواردن، شـەنگو ماندوونەو وەختە حەیاتیان لەبەر ببڕێ، دەکرێ سوود لـەو دەرفەتـە وەربگـرینو بەسەریاندا زاڵ بین. ئەگەر وا نەکەین، وەك ئەو قسەیەمان لێ دێ کە دەڵێ:

**(پەروەردەکردنی پڵنگ واتە بەڵا بەسەرخۆدا هێنان)**

بـەم شـێوەیە (لیوبـانگ) هێزەکـانی خـۆی کـۆکردەوەو لەگـەڵ سـوپای (چـۆ) جەنگا، ئاخیریش بەسەریاندا سەرکەوت، ئەوسا (کسیانگ یو)ش خۆی کوشت.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**پڵنگ پـەروەردەکردن، واتـە هـاتنی بـەڵا**) ئاماژەیـە بـۆ ئەوەی کە سەقامگیری بەڵاهێنەو بەڵا دەهێنێ.

دوای ماوەیەکی کەم لە زیافەتی هۆنگمان، (کسیانگ یو) بۆ بەدیل گرتنی (کسیانیانگ) سەرکردایەتی سوپایەکی کرد. بەو جۆرە، (زینگ)ی پاشای گەمارۆدراوی (کین)ی کوشتو کۆشکەکانی (کین)ی سوتاندو لەگەڵ چەند کەنیزەکێکو چەند ئافرەتێکی بەدیل گیراو بەرەو رۆژهەلآت گەڕایەوە.

یەکێك لە راوێژکارەکانی داوای مانەوەی لە ناوچەی (گانزۆنگ) لێکردو پێی گوت:

– (گوانزۆنگ) لە هەموو لایەکەوە بە شاخو رووبار پارێزراوەو زەوییەکەشی بە پیتە، دەی لێرە پایتەختەکەت دابمەزرێنەو هەر لێرەوەش دەتوانی دەست بەسەر هەموو ولآتدا بگری.

(کسیانگوش) تەماشای کۆشکە خاپوورکراوەکانی (کین) ی کردو ئارەزووی گەڕانەوە بۆ نیشتمان لە کەللەی دا، بۆیە گوتی:

– دوای کۆکردنەوەی ماڵو دەست بەسەرداگرتنی پلەو پایەی بەرز، نەگەڕانەوە بۆ نیشتمانی دایك، وەك شەورۆکردنە بە جلی ئاوریشم، ئاخر کێ بە سەروەتو سامانە زۆرەکەت دەزانێ؟

بەم جۆرە بەرەو رۆژهەلآت نەخشەی گەڕانەوەی داڕشت.

دواتر، دەربڕینی (**بە شەو رۆیشتن بە جلی ئاوریشم**) ئاماژەیە بۆ نەتوانینی دەرخستنی سەروەتو پلەو پایە لە بەرامبەر خەڵکیدا.

دوای داگیرکردنی پایتەختی فەرمانڕەوایانی (کین)، کە (کسیانگ یو) بڕیاری گەڕانەوەی بۆ نیشتمانەکەی دا، ئەو راوێژکارەی کە ئامۆژگاری (کسیانگ یو)ی دەکرد، کە پایتەختەکەی لە (گوانزونگ) بنیات بنێ، بە گاڵتەپێکردنەوە گوتی:

– دەڵێن خەڵکی (چولیسوا) لە مەیموونی بە شەپقە بترازێن، چیتر نین، هەر واشە، **هەڵبەت** زۆر راستە.

کە کسیانگ یو گوێی لەمە بوو، فەرمانی دا ئەو کابرایە لە سێدارە بدرێ.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **(مەیموون بە شەپقە)** یان **(مەیموون لەگەڵ شەپقەکان)** بۆ گاڵتەجاڕیی بەکاردەهێنرێتو بۆ ئەو کەسە هیچو پووچو سووکو چرووکانە بەکاردێ کە بەفیزەوە هەوڵی خۆ دەرخستن دەدەن.

## (٤٢)

# هەرکاتێك ( هان کسین ) ئەمری دەکرد سوپا زیاتر بێ، ئەوا باشتر دەبوو



دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی کەم (لیوبانگ) بووە ئیمپراتۆری (هان)، دەربارەی توانای ئەفسەرەکانی لەگەڵ (هان کسین) مشتومڕی بوو، بۆیە لە (هان کسین)ی پرسی:

– کابرایەکی وەکوو من دەتوانێ سەرکردایەتی چەند سەربازان بکات؟

هان کسین وەڵامی دایەوە:

– تەنیا دەتوانێ سەرکردایەتی سەد هەزار کەس بکات.

ئەمجارەش (لیوبانگ) لێی پرسی:

– ئەدی دەربارەی تۆ چییە؟

(هان کسین) وەڵامی دایەوە:

– بۆ من چەند ژمارەکە زۆر بێ، ئەوا باشتر.

(لیوبانگ) پێکەنیو گوتی:

– ئەگەر وایە، بۆ تۆش نابیە پێڕی من؟

(هان کسین) یش وەڵامی دایەوە:

–بەهرەو توانای تۆ لە سەرکردایەتی کردنی سوپا خۆی نانوێنێ، بەڵکو لە سەرکردایەتی ئەفسەرەکان دەوەشێتەوە، لەبەرهەندێ من پێڕی تۆم.

لیوبانگ کە گوێی لەمە بوو، لە دڵەوە پێکەنی:

دواتر، ئەم دەربڕینە مەبەست لێی ئەوەبوو زۆرترینەکە باشترە.

## (٤٣)

# لە رووبەڕووبوونەوەی پیاوماقوڵانی رۆژهەڵاتی یانگتزی، زۆر شەرمەزار بوو



لە ساڵی ٢٠٢پ. ز، کسیانگیوو سوپاکەی لە لایەن سوپای (هان) لە گایکسیاوە گەمارۆ درابوون، شەوێك لە شەوان لەگەڵ هەشت سەد کەس لە پیاوەکانی، گەمارۆکەی شکاند. سوپای (هان) یش هەر بەدوایانەوە بوون، هەتا وای لێهات تەنیا بیستو شەش کەسی لەگەڵ مانەوە، کاتێ گەیشتنە گوندی (وجیانگ) تا بەرەو رۆژهەلأت لە روباری (یانگتزی) بپەڕنەوە، کوێخای گوندەکە کە نزیکی (کسیانگ یو) بوو لەوێ حازربوو، داوای لێکردن تا زووە لە رووبارەکە بپەڕنەوە.

کسیانگ یوش گوتی:

– کە رووبارم بڕیو هاتمە بەری رۆژئاوا، هەشت هەزار رۆڵەو برای رۆژهەلأتی (یانگتزی)م لەگەڵ بوو، ئێستاش دەبینی کەسیان نەگەڕاونەتەوە، ئاخر چۆن دەتوانم لە رۆژهەلأتی (یانگتزی) رووبەڕووی پیرەپیاوان ببمەوە؟

لەو کاتەدا ئاوڕێکی دایەوەو هێرشی بردە سەر سوپای (هان) و سەدان کەسی لە دوژمنەکانی خۆی کوشتو ئەویش لەبەر برینە زۆرەکانی خۆی هەر هاوار هاواری بووو دەینالأند، ئاخیری دەماری قورقوڕاگەی پساو حەیاتی لەبەر بڕا.

لەوەوپاش، **(لە رووبەرووبوونەوەی پیاوماقولأنی رۆژهەلأتی یانگتزی زۆر شەرمەزار بوو)** بەکاردەهێنرێ بۆ وەسفی هەستی کەسێ لە رووبەرووبوونەوەی خەڵکانی تر زۆر شەرمەزار بێو لەکاتی گەڕانەوەی بۆ ماڵ، لە کارێك کە تێیدا ببەزێ.

ئەم هەقایەت پەسنی (یونانگ) بۆ ئەفسەرەکانی دەگێڕێتەوە.

لە رۆژێکی ساڵی ٢٠٢ی پ.ز، دوای ئەوەی (لیوبانگ) بووە ئیمپراتۆر، لە پایتەختەکەی لەگەڵ ئەفسەرەکانی دانیشتبوو، مشتومڕی بوو لەسەر ئەو هۆکارەی کە بووە هۆی ئەوەی بۆ ئیمپراتۆریی سەرکەوێ و (کسیانگیو)ش بدۆڕێ.

دانی بەوەدانا کە ئەو سەبارەت بە دانیشتن لە خێوەتی سەرکردایەتیو بەڕێوەبردنی ستراتیژییەتێکی سەرکەوتوو بۆ شەڕێك کە لە رووبەری هەزار لی–ش بێت، لەچاو (زانگ لیانگ) شکۆی کەمترە.

دواتر گوتی:

– بێگومان من وەك (کسیاوهی) سەبارەت بە ئاساییکردنەوەی وڵات کارامە نەبووم، کە وەهابێت خەڵك رازی بێتو ببێتە سوپایەکی رێك.

هەروەها دانی بەوەشدانا، سەبارەت بە سەرکردایەتی کردنی سوپایەکی یەك ملیۆن کەسیو بەدەستهێنانی سەرکەوتنیش لە هەموو شەڕێکدا، ناشێ خۆی لەگەڵ (هان کسین) بەراورد بکا.

گوتیشی:

– لەبەرئەوە، من دان بە توانای بەهێزی ئەو پیاوانە دادەنێم، ئەگەرچی منیش لەچاو بارودۆخی ئەوان لە پلەوپایەیەکی گرنگدا چەلەنگیشم. لەلایەکی تر (کسیانگ یو) راوێژکارێکی زۆر باشی هەبوو، کە ناوی (ڤانگ زانگ) بوو، بەڵام وای لێهاتبوو، قەت گوێی لە ئامۆژگارییەکانی (ڤان زانگ)یش نەدەگرت، لەبەرهەندێ ئیمپراتۆریەت بەزیو منیش ئەمەم قازانج کرد.

دواتر دەربڕینی ( وەدی هاتنی سەرکەوتن لە خێوەتی سەرکردایەتییە) بۆ پەسنی کەسێکە کە توانای زاڵ بوونی بەسەر بارودۆخە سەختەکان هەبێ.

## (٤٥)

# لە کاتی لەناوبردنی کەروێشکە کێوییە فێڵبازەکان، سەگی راوێ دەکوژرێن



ئەم گوتەیە لە کتێبی (هان ڤی زی) وەرگیراوە.

لە ساڵی ۲۰۱ی پ. ز، ئیمپراتۆر (لیوبانگ)ن وای گومان برد کە (هان کسین)ی پاشای (چۆ) نەخشەی مانگرتن دادەڕێژێ، بۆیە ئیمپراتۆر بە بیانووی سەردانی کردنی زەلکاوەکانی (یونمنگ) چووە محاری ئەوان، کە هاتە پێشوازی، هان کسینی دەستگیر کرد. (هان کسین)یش گوتی:

– مەسەلەیەك هەیە دەڵێن: لە کاتی لەناوبردنی کەروێشکە فێڵبازەکان، سەگی راوێ دەکوژرێن‌و لەکاتی فەوتانی باڵندەکانی پۆڕیش، تیرو کەوانەکان دووردەکەونەوە. دوای سەرکەوتنیش بەسەر هەموو دوژمنەکان، راوێژکارەکان دەکوژرێن‌و دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتیش ئێستا سەلامەتە، کوشتنی من پێویستە.

بەڵام (لیوبانگ) ئەوی لەو گلەیی‌و گازاندانە بەخشی‌و کردی بە فەرمانڕەوای (هەوایین).

لەوەبەدوا، دەربڕینی **(لە کاتی قڕکردنی کەروێشکە کێوییە فێڵبازەکان، سەگی راو دەکوژرێن)** بۆ ئاماژەدانە بەوەی لە کاتی سەرکەوتنی هەر پلانێکی دیاریکراو، ئەوانەی دەستیان لەو سەرکەوتنە هەبووە، نەك هەر پێویست نین، بەڵکو دەشکوژرێن.

دوای ئەوەی لیوبانگ بووە ئیمپراتۆر، پشتگیری خانمە دلبەرێکی کرد کە ناوی (کی) بوو، (لیوبانگ) ویستی (لیوینگ)ی جێنشینی لە میراتی تەختی دەسەڵات بۆ (لیوروی) کوڕی (کی) لابدا.

پاشان (زانگ لیانگ) ئامۆژگاری (لیوینگ)ی کرد، کە چوار بیرمەندی بەناوبانگ بانگ بکاو بیانخاتە کەناری خۆی. لیوبانگ لەوەدا واقی وڕما بوو، بە هەر چوار کەسەکەی گوت:

– بەراستی ئەوە چەند ساڵە داوام لێکردوون بێنە کەناری من، بەڵام ئێوە هەمیشە ڕەتتان کردۆتەوە، بۆیە هەنووکە من وا دەبینم کە ئێوە ئێستا هاتوونەتە گەڵ کوڕەکەی من.

چوار کەسەکە وەڵامیان دایەوە:

– جەنابتان بە سوكو ریسوایی لە بیرمەندان دەڕوانن‌و حەزدەکەی گاڵتەیان پێ بکەی، لەبەرئەوە شتێکی باشمان کردو سوودمان وەرگرت کە خۆمان لە سووکایەتییەکان دوورگرت. بەڵام بیستمان جێنشین کابرایەکی خۆش مەشرەبەو ڕێزی بیرمەندان دەگرێ‌و گرنگییان پێدەدا، لەبەرهەندێ رازی بووین کە بچینە گەڵی.

لیوبانگ نەیتوانی هیچ بڵێ، تەنیا گوتی:

– تکاتان لێدەکەم لەگەڵ جێنشین هەڵسوکەوتتان باش بێ.

دوای ئەوە (لیوبانگ) بە (کی) گوت:

– پێشتر گۆڕینی جێنشینم مەبەست بوو، بەڵام لەگەڵ هاتنی ئەم چوار بیرمەندە بۆ لای ئەو، باڵەکانی تەواو گەشانەوەو ناکرێ تازەش بگۆڕدرێ.

لەوەبەدوا، ئەم دەربڕینە بەکاردێ بۆ کەسێك کە یارمەتی بەدەست بهێنێ‌و ببێتە کەسێکی بەهێزو وای لێ بێ لە ڕەوشێکی پڕ ئاسایش‌و سەلامەتیدا بێ.

(کسیاوهی) سەرۆك وەزیرانی ئیمپراتۆرییەتی (هان)، لە ساڵی ١٩٣ی پ. ز، کۆچی دوایی کرد، ئەو کاتەی کە لەحەولە حەولی روحیٚ دابوو، وەسیەتی کرد کە (کاوکان) جێی بگرێتەوەو ببێتە میراتگری.

کە کاوکان دەست بەکاربوو، بەتەواویو بیٚ دەسکاری، پەیڕەوی هەموو یاساو ڕێساکانی (کسیاوهی) کرد، کە بێگومان ئەمەش کاتی زۆری بۆ گەڕاندەوەو بەشی هەندیٚ کاتی پیٚ بەخشی کە لە گاڵتەو گەپی سەرف دەکرد.

ئیمپراتۆر (لیونگ)یش لەو رەفتارانەی سەرۆك وەزیرانی نویٚ زۆر بێزار بوو، تا وای لێهات رۆژێکیان زۆر بە توندی سەرکۆنەی کرد.

(کاوکان) یش لەسەر قسەی خۆی نەهاتەخواریٚو بە گەورەکەی خۆی گوت:

– ئاخر چۆن داناییو توانایی جەنابتان لەگەڵ توانای ئیمپڕاتۆری گەورە (لیوبانگ)ی باوکی (لیوینگ)و دامەزرێنەری بنەماڵەی زنجیرەی فەرمانڕەوای (هان) بەراورد دەکریٚ.

ئیمپراتۆریش بە شپرزەیی وەڵامی دایەوە:

– چۆن دەتوانم خۆم بە ئیمپراتۆرییەتی مەزن بەراورد بکەم.

لەوکاتەدا (کاوکان) لێی پرسی:

– جەنابتان چۆن تواناکانی من لەگەڵ توانای پێشینەکانی (کسیاوهی) بەراورد دەکەن؟

لیوینگ وەڵامی دایەوە:

– وایارە من پایەم زۆر لە سەرۆك وەزیرانی پێشوو کەمترە ! !

لەوکاتەدا کاوکان پێی گوت:

– قوربان، خاوەن شکۆ ! ! تۆ راستیی دەبێژی، ئیمپراتۆری مەزن سەرکەوتو لە بڵاوکردنەوەی ئاشتی لەو ئیمپراتۆرییەدا کسیاوهیشی لەگەڵ دایە، هەردووکیان

هەموو رێساو پێداویستییەکانی حوکمرانییان داناوە، بۆیە رێزگرتنی ئـەو یاسـایانە بەپێی توانا پێویستی سەرشانمانە، ئەگەر وامان کرد ئەوا هەموو شتێ باش و وەك خۆی دەبێ.

ئیمپراتۆر قەناعەتی هاتو گوتی:

–منیش وەك ئەوەی گوتت وادەبم.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**کاوکان پـەیرەوی دەسـتوورەکانی کسیاوهی دەکـات**)، ئاماژەیە بۆ ئەو جێنشینەی کە بە تەواوی‌و کت‌و مت پەیڕەوی پێـشینەکەی خـۆی بکات.

دوای مردنی (لیوبانگ)ی یەکەم ئیمپراتۆری فەرمانڕەوای تایەفەی (هان) لە ساڵی ١٩٥پ. ز، جڵەوی دەسەڵات کەوتە دەست ئیمپراتۆر (لۆزی)، ئەم خانمە ئیمپراتۆرە هەر زوو بۆ ئەوەی تایەفەیەکی نوێ کە ناوی نا تایەفەی (لو) بنیات بنێت، کەسانی نێو خێزانەکەی لە پۆستی گرنگی حکومی دانان.

کە (لوزی) لە ساڵی ١٨٠ پ. ز، مرد، کوڕو برایەکانی بە فەرماندەی (لولو) دەستیان بەسەر سوپادا گرت، ئەوکاتە برای (لیوبانگ)و نەوەکەی، لەم نێوانەدا بە مەبەستی دووبارە گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆ خانەوادەی (لیو)، شۆرشێکیان دژی خانەوادەی (لو) هەڵگیرساند، (زوبو) فەرماندەی سوپایەکانی (هان)ی دەکرد، دڵی زۆر لە فەرمانڕەوای خانەوادەی (لو) شکابوو، دەیەویست رێگایەك بدۆزێتەوەو لە دەسەڵاتیان لابدا. بۆیە رۆژێکیان بۆ ئەم مەبەستە هەموو پیاوەکانی خۆی کۆکردەوەو پێی گوتن:

– ئەوەی لایەنگیری خانەوادەی (لیو)ە، با دەستی چەپی بەرز بکاتەوە.

بەپەلە گوتیشی:

– ئەوەی لایەنگیری خانەوادەی (لو) دەکات، با دەستی راستی بەرز بکاتەوە.

سوپا هەمووی دەستی چەپی بڵند کرد، شۆڕشەکە بە کوشتنی کەسانی خراپی دەسەڵاتو دانانی (لیوهینگ)ی کوڕی (لیوبانگ) بۆ سەر تەختی دەسەڵات کۆتایی پێ هات.

لەپاش ئەمە، دەربڕینی (بەرزکردنەوەی دەستی چەپ) بۆ لایەنگیریکردن بەکاردێت.

ئەم هەقایەتە لە چیرۆکەکانی ئیمپراتۆر (وۆ)ی بنەماڵەی (هان) وەرگیراوە، کە نووسەرەکەی (بان گۆ) یە.

کاتێك (لیوچی) (١٥٦–٨٧ پ. ز)، دواتر بووە ئیمپراتۆری (وۆ)، تەمەنی چوار ساڵان بوو، شاژن لە پشتەخۆی سوارکردبوو، پرسیاری لێکردبوو ئایا ژنی دەوێ؟ ئەویش گوتبووی بەڵێ.

شاژنیش ئاماژەی بۆ (ئەجیاو)ی کچی خۆی کردبوو، لێی پرسیی بوو:

– رات بەرامبەر ئەجیاو چۆنە؟

(لیوچی) ش پێکەنی و گوتی:

– زۆر جوانە! ئەگەر توانیت و کارێکت کرد ئەجیاو بۆ من بێ، ئەوا لە ماڵی شووشەی دادەنێم.

کە (لیوچی) ش گەیشتە سەر تەختی دەسەڵات، ئەجیاوی کردە خانمە ئیمپراتۆر، بەڵام دواتر لەسەر کار لایبردو خانمە خۆشەویستێکی کردە دۆستی خۆی.

لەوەبەدوا، ئەم دەربڕینە بۆ دلبەری دۆستو خۆشەویستو کچی ئەویندار بەکاردێت.

لـە سـەردەمی زنجـیرەی (هـان) دا، کـە (ڤـانگین) وەزیـری داد بـوو، لـە ماڵەکەیدا، بەردت هاویشتبا بە عەردی نەدەکەوت، پڕ بوو لە خـەڵکی ماستاوچـی، بەڵام دواتر بۆ ماوەیەك لەسەر کار لادرا، وایلێهات میوانـەکان زۆر کـەم بوونـەوەو لێــی دوور دەکەوتنــەوە، بــەجۆرێك لەبــەردەم دەرگــای ماڵەکــەیان چـۆلەکەت راوکردبان.

کە جارێکی تر هاتەوە سـەر کارەکـەی، دیسان خـەڵك بـە لێشاو دەچوونەوە ماڵەکـەی‌و داوای خزمـەتکارییان دەکـرد. (زای) لەسـەر دەرگـای ماڵەکەیـدا بـە خەتێکی پان، تێبینییەکی هەڵواسی:

**(هاورێیەتی لەساتە تەنگاوییـەکانی ژیـان‌و مردنـدا تاقیـت دەکاتـەوە، لـەو رێگایەی کە جیهان لەگەڵ هەژاران‌و دەوڵەمەندان رەفتار و هەڵسوکەوت دەکـا، لەو گۆڕینـەوەی نێـوان ناوبـانگ‌و خۆبەکـەم دانـان، کـە راسـتیی پەیوەندییـە مرۆڤایەتییەکان بەدەردێخێت.)**

لەوەبەدوا، دەربڕینی **(راوی چۆلەکان لـەزارکی دەرگـادا)**، وەك ئاماژەیـەك بـۆ کەسێتی دوورەپەرێزو کەنارگیر بەکاردەهێنرێت.

# (٥١)

# گاوان و کچە بەرگ درووەکە

# دروست کردنی پردێك لە قەلەباچکە



ئەم دوو دەربڕینە لە هەقایەتێکی میللی وەرگیراون.

هەقایەتەکە دەڵێ:

حەوت کچی بەرگدرووی ئەفسانەیی لە دەرباری ئیمپراتۆر (ئەلیشب) کاریان دەکرد، ڕۆژێکیان بۆ ئەوەی خۆیان لە کانییەکی سەر زەوی بشۆن بۆ سەر عارد هاتنە خوارەوە.

بە ڕێکەوت، گاوانێکی جحێڵیان بینی، کە بەوێدا تێپەڕیو جلی کچی گچکەی دزی. بۆیە کچە نەیتوانی بگەڕێتەوە ئاسمان، لەسەر زەوی مایەوە، تا ببێتە ژنی گاوانەکە. کە ئیمپراتۆریش بە حارو مەسەلەکەی زانی، پاسەوانەکەی رەوانەی زەوی کرد، تا کچەکە بۆ ئاسمان بگەڕێنێتەوە. گاوان خۆی گەیاندێ، بەڵام شاژنی دایکی ئاسمان، پێش ئەوەی گاوان خۆ بگەیەنێتە کچە، دەرزییەکی زیوینی لە ملپێچەکەی کشاندەوەو خەتێکی لە ئاسمان کێشا بۆ جیاکردنەوەی هەردوو هاوسەر لەیەکتری، ئەم خەتە دوای ئەوە بە ڕێگای پێویستی دەناسرا. (لە چین بە رووباری زیوی، یان رووباری ئاسمانی بەناوبانگە).

شاژنی دایکی ئاسمان ڕێگای بە گاوانو کچەدا، کە لە ساڵێکدا تەنیا یەك جار یەکتر ببینن، ئەویش لە حەفتی مانگی حەفت لە نیوەشەوێکدا. بەڵام هەردوو ئەویندار بە لێکدابڕاوی لە رووباری زیوین مانەوە.

بەسەرهاتی ئەمانە کاریگەری لەسەر هاوسۆزیی هەموو قەلەباچکەکانی سەر زەوی هەبوو، ئەوانە بەو شەوە بەرەو ئاسمان فڕینو بە باڵەکانیان پردێکیان لەسەر رووبارە زیوینەکە دروست کرد، تا گاوانەکە بتوانێ چاوی بە کچەکە بکەوێ.

لەوەبەدوا، دەربڕینی، (**گاوانو کچە بەرگدرووەکە**)، ئاماژەیە بۆ ژنو مێردێك، یان دوو ئەویندار، کە ناچار بکرێن دوور لە یەکتر بژیێنو دەربڕینی (**دروستکردنی پردێك بە قەلەباچکان**)، واتە ڕێکخستنی ژوانێکی ڕۆمانسی.

## (٥٢)

# باڵندەی سیمرخ دە هەزار ( لی ) دەفڕێ



فەلسەفەی کلاسیکیی تاوی کە بە (تیمنا)ی نووسەرەکەی (زوانگ زی- ٣٩٦-٢٨٦پ. ز) ناونراوە، ئەم هەقایەتەی خوارەوەشی لەخۆگرتووە.

جارێکیان، ماسییەکی گەورە هەبوو ناوی (کون) بوو، لە دەریای باکوور دەژیا. ئەم ماسییە گۆڕدرا بۆ باڵندەیەکی زەبەلاح کە ناوی سیمرخ بوو.

باڵندەی سیمرخ بڕیاریدا رووبەرێکی زۆر بەرەو دەریای باشوور بفڕێ و بەرزبێتەوە. کە گەیشتە بەرزایی نۆهەت هەزار (لی) لە ئاسمان، هەموو شتەکانی سەر زەوی زۆر بچووك بوونەوە، بەڵام (با) یارمەتی داو گەیاندیە شوێنی مەبەست، دوای ئەوەی گەشتەکەی شەش مانگی خایاند.

لەوەبەدوا، دەربڕینی(**باڵندەی سیمرخ دە هەزار لی دەفڕێ**) بۆ ئومێدی کەسێکە بە داهاتوویەکی پرشنگدارو سەرکەوتنێکی گەورە.

ئەو کاتەی ژنی (زۆنگ زی) مرد، (هوی زی) هاوڕێی چووە لای تا سەرەخۆشی لێ بکا، دیتی (زۆنگ زی) لەو گۆڕەی دانیشتووەو دەسکە جونی لە جونییەکی سەرەونخوون دەکوتیو گۆرانییان دەڵێ.

(هوی زی) پێی گوت:

– ژنەکەت لەگەڵت ژیا، منداڵی بۆ بەرهەمهێنایو بەخێوی کردن، نەگریانت بۆی، تەنیا لەبەرئەوەیە ئەو پیر ببوو، لە مردنێی گەڕێ دەتوانم لێی تێ بگەم، بەڵام ئەو جونی کوتانەو ئەو گۆرانی گوتنە! ئایا تێپەڕاندنی سنووری حەزەکانت نییە؟

(زۆنگ زی) وەڵامی دایەوە:

–مەسەلەکە بەو شێوەیە نییە. کە مرد، بێگومان پەرۆشم بوو، بەڵام دوایێ زانیم لە راستیدا ئەو هەر بە نەبوو حیساب بوو، تەنیا شێوەو ژیانێك بوو، دواتر هەوبوو مرد. هەر دەڵێی چوار وەرزەکانی ساڵە دەگۆڕێ، کە دەکرێ پێی بچوێنین.

ئەها ئەو ئێستا لە ژوورێکی گەورەدا، لەسەر گازی پشتێ کەوتووە، ئەگەر گریامو دامە پرمەی گریان، واتە ئەو کاتە من لە یاساکانی سرووشت ناگەم، بۆیە چیتر نەگریام، وازم لە گریان هێنا.

دواتر، دەربڕینی **(نیگەرانی لە جونی کوتان)** بۆ پەرۆشیو خەم خواردن لەسەر ژن مردن بەکاردێت.

(زۆنگ زی) لە وتارێکدا نووسیبووی:

یەکێك لە کانییەکان وشکی کردبوو، ماسییەکانیش لەناو رووبارە وشك بووەکە بوون، بەهۆی یاریکردنەوە هەندێك هەندێکی تریان شێداردەکردەوە.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (شێدارکردنەوە بە یاریکردن) بۆ وەسفی ئەو کەسە دەست کورتانە هات، کە یارمەتی هەندێك کەس دەدەن ئەگەر بە کەمێکیش بێ و بە گوێرەی توانا کارئاسانیان بۆ دەکەن.

## (٥٥)

# تا بەراوردکردنەکە سادەتر دەبوو، پتر پوخت دەبوو



کابرا لە (زۆنگ زی) پرسی:

– ئەریٚ ئەو (تاو)ەی کە هەموو دەمیٚ تۆ باسی دەکەی لە کوێیە؟

زۆنگ زی وەڵامی دایەوە:

– ئەو لە هەموو شوێنێ ئامادەیە.

کابرا هەر پێی داگرت:

– تکا دەکەم، ئەگەر روونتر قسە بکەن.

(ئەو لەنێو سیسرکو مێروولان دایە)

–بۆ لەو ئاستە سووکو سادەیە؟

(لەنێو گژوگیای بەزەرِو سەوزە گیادایە)

–بۆچی ئەمجارەیان لەنێو سادەتریشدا! !، هەر بێتامت کرد؟

(ئەو لەنێو خشتی سوورو بەرد دایە)

–حەککو، بۆ بەراوردکردنەکەت تا دێ سادەتر دەبێ؟

(ئەو لەناو میزو قشپلان دایە)

کابرا کە ئەمەی بیست، کرِو بێدەنگ بوو، نوقەی لێوە نەهات.

(زوانگ زی) گوتی:

=بەو پرسیارانەت دەستت بە جەوهەری (تاو) ناکەوێ، ئەو کاتەی سەرپەرشتیاری بازار، رۆنی بەراز بۆ تێهەڵسوینو کوتانەوە دەبینێتەوە، هەر کە ئەو بەشە کەمەی لەشی بەری دەکەوێ، پشکنینەکە وردتر دەبێ.

ئەوەی کەوا (زۆنگ زی) گوتی، ئەوەیە کە هەر جارێ شتی زۆر سادەو ساکارت برِی، دەتوانی زۆرترین راستی بەدەست بێنی.

لەوەبەدوا، دەربرِینی (**هەر کاتێك بەراوردکردن سادەو ساکاربوو، ئەو کاتە زۆرترین وردیو پوختییە**) بۆ وەسفی رەوشو حالەتی شپرزەیی یەك لە دوای یەك بەکاردەهێنرێ.

دوای ئەوەی (زوانگ زی) هەژارو دەست کورت بوو، جارێکیان، داوای قەرزی لە فەرمانبەرێکی دەوڵەمەندی حکومی کرد. فەرمانبەرەکە پێی گوت:

– کە هەموو باجو سەرانەی موڵکەکانم کۆکردەوە، ئەوجا سێ سەد (یی)ی زێڕت دەدەمێ، ئایا ئەوەندەت بەس نییە، بەشت ناکا؟

(زوانگ زی) زانی کە ئەمە خۆدزینەوەیە لە داواکەی، بۆیە بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

– کە بۆ ئێرە هاتم، لەسەر ڕێگادا سوورە ماسییەکم دیت، لە کەنارێکی وشك کەوتبوو، ماسییەکە هاواری بۆ هێنامو گوتی:

– مـن لای ئیمپراتـۆری دەریـای ڕۆژهـەڵات، فەرمانبـەرێکی ڕەسمـیم. داوای لێکردم دۆلکە ئاوێکی بۆ بێنم، تا ژیانی ڕزگار بکا.

وەڵامم دایەوە:

– کە بێگومان من بە پەلە ئەو داوایە لە (وو ویو)ی پاشام دەکەم، تا ڕووباری ڕۆژئاوا بێنێو بە شێوەیەك هەڵبقوڵێ دواجار ژیانی ڕزگار بێ.

بەڵام ماسییەکە بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

– ماڵی خۆم جێهێشتو ئێستا هیچ شوێنێکم نییە تا تێیدا نیشتەجێ بم، بەڵام چۆڕە ئاوێك دەتوانێ ژیانم ڕزگار بکا، ئەگەر ئەمە وەڵامی تۆیە، وا باشە بچی لە بازاڕی ماسیی دێمەکار، لە من بگەڕێی.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**بازاڕی ماسیی دێمەکار**) ئاماژەیە بۆ کەسێکی دەست کورت، کە بەڵێنی یارمەتی پێ بدرێ، بێ ئەوەی بەڵێنەکە بگاتە سەر.

## (٥٧)

# پارچەکردنی گایەکە

## رووبەرێکی گەورە بۆ چەقۆی گۆشت فرۆشەکە



چێشت لێنەرێك هەبوو، جومگەكانی (گا)ی بۆ مامۆستاكەی پارچە دەكرد، بە دەستەكانی هێزی دەدایە بەرو بە پێیەكانیشی دەیكوتایەوە، بە شانەكانی دەیكوشیو بە ئەژنۆكانی تینی دەخستە سەر، دەنگی ئەو چەقۆیەی كە گایەكەی پارچە پارچە دەكرد، زۆر بە دەنگی مۆسیقا دەچوو، هەڵسوكەوتی چێشت لێنەرەكەش عەینەن جوڵەی سەماكردن بوو.

مامۆستاكەی زۆری پێ سەرسام بوو، بۆیە پێی گوت:

– ئەمن (تاو)م لە وەستایی زیاتر خۆش دەوێت. ئێستا من بە عەقڵم كار دەكەم، ئەو بۆشاییەی نێوان گۆشتو ئێسكان واز لێدێنمو ریشاڵەكان بە گوێرەی بونیادی سروشتی خۆیان پارچە پارچە دەبن. لێوو لموزی چەقۆكە وەك ئەوە وایە هەر ئەستووریش نەبێ، لەبەر ئەو نێوانەی لەنێوان لەشی گیاندارەكەدا هەن. بۆیە هەر كاتێك شتێكی باریك بێتە ناو رووبەرێكی گەورە، لەوێ بە بەردەوامی رووبەرێكی گەورە هەیە تا بە فەراحی تێیدا بجوڵێتەوە. بۆیە وێڕای ئەوەی بە درێژایی نۆزدە ساڵە چەقۆی من بەكارهاتووە، بەڵام هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، هەر بەكارە، هەروەك ئەگەر لەلایەن (تو)وەش لە هەسان دراوە. بەڵام ئەو شوێنانەی كە پارچەكردنیان زەحمەتە، دەبێ بجوڵێم، تا لە پارچەكردنی گایەكە بە نەرمیو بە ئاسانی لەسەر زەوی، دڵنیا بم. ئەو كاتە دەتوانم چێژ لە دەسكەوتە گرنگەكەم ببینم.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **پارچەكردنی گایەكە**، بۆ وەسفی وەستاییو بە سەلیقەیی و پوختەیی وردیی بەكاردێت. هەرچی دەربڕینی **رووبەرێكی گەورە بۆ چەقۆی سەربڕەكەیە**، بۆ وەسفی كەسێكی زۆر بە سەلیقە لە ئیشێكی دیاریكراو، یان ئەو كەسەی كە كارەكەی بە پوختیو ئاسانی دەكات، بەكاردەهێنرێت.

ئەم دەربڕینە لە لێدوانەکانی (زوانگ زی) وەرگیراوە، کە زۆر سوور بوو لەسەر هەبوونی جیاوازی لەنێوان رابردووو ئێستاداو پێی وابوو: ناکرێ دامەزراوەی کۆن بۆ داهاتوو بەکاربهێنرێن، چونکە بە جیاوازی کات، رێگاکانیش جیاواز دەبن. بۆیە دەیگوت ئەو رێگایانەی کە (سێ مەزنەکەو پێنج ئیمپراتۆرەکان) بەکاریان هێناوە، جیاوازن. بەلاّم هەموویان لە سەرکردایەتی کردنی ولاّت سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، بەراستی میوەکان جیاواز دەبن، بەلاّم هەمووشیان تامو چێژیان خۆشە. ئەگەر مەیموون خۆی لەناو جلو بەرگی (مارکێز زو) بشارێتەوە، بە دلّنیاییەوە پۆشاکەکە پارچە پارچە دەبێ، چونکە مەیموون لە (مارکیز زو) جیاوازە، بەم شێوەیە، بەکارهێنانی دامەزراوە کۆنەکان لە سەردەمەکانی دواتردا، وەك لێخورینێکی سەر عاردێکی رەقو تەق یان عارەبانە هاژووشتنێکە لەناو ئاو. کۆششی کەس بە خۆڕایی ناڕوا، بەلّکو خۆیشی ئەزیەت دەبینێ.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **(کارکردنی بە ماندووبوون، بەلاّم بێ کەلّك)** بەکاردێت بۆ ئاماژەدان بە کارێکی پڕ ماندووبوونی بێ سوود، یان کارێکی پڕ ماندووبوونی زۆر، بەلاّم بێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکی هەبێ.

## (٥٩)

# بە ڕێگایەکی ترسناک حسێب کردن



جارێکیان (زۆنگ زی) بۆ پاراستنی تەندروستییەکی باش، باسی لە رێگایەك کرد، بیرۆکەی سەرەکی ئەو بریتی بوو لە پێویستی گرنگیدان بە تەندروستیی عەقڵو گیانو فەرامۆش نەکردنی هیچ کامێکیان.

هەر بۆ نموونە، ئەو کاتەی جەردەو رێگرەکان شەڕ دەکەنو رێگا دەگرنو دەیەکی خانەوادەیك دەکوژن، ئەو کاتە باوكو کوڕو براگەورەو بچووکەکان لە مەترسیدا دەبن، ئەگەر هەر یەکێ لەمانە بیەوێ بڕوات، ئەوان بە کۆمەڵێك چەکدارەوە لەگەڵی دەڕۆن، بەلاّم زۆربەی ئەو کەسانە تەنیا دەپرژێنە سەر مەترسییە دیارو بچوکەکانو مەترسییە گەورەکان لەبیردەکەن. بۆ نموونە زوو مردن لەبەر زێدەعەزافی لە ژیانی ئاهەنگو کەیفو سەفاو خواردنو خواردنەوەدا.

زۆنگ زی گوتی:

– ئەو جۆرە زیادەڕەوییە دەشێ بە مەترسی دابنرێ، بە ئەندازەی ئەو رێگایەی کە لێوانلێوە لە شەڕ فرۆشی.

لەوەبەدوا، ئەم دەربڕینە ئاماژەیە بۆ ئەنجامدانی کارێکی ترسناكو دەستەوەستان بوون لەبەرامبەر مەترسیدا.

## (٦٠)

# گۆڕینەوەی هیربارى هاونشینانى ئیمپراتۆر بە مە نجەڵی مجێورو سواڵکەران



ئەم هەقایەتە لەو بەسەرهاتەی کە خراوەتە پاڵ (زوانگ زی)یەوە، وەرگیراوە.

هەقایەتەکە ئاماژە بەوەدەدا، کە لە سەردەمی ئیمپراتۆڕ (یاو) دا، خواپەرستێك هەبوو، ناوی (کسویو) بوو، ئیمپراتۆر بەبەرگوێیانی کەوتبوو، کە ئەو خواپەرستە کابرایەکی زۆر چاکە، بۆیە ئیمپراتۆر تەختی خۆی پێشکەش کرد.

(کسویو) بە ئیمپراتۆری گوت:

– بەدڵنیاییەوە تۆ حوکمڕانییەکی باشت کردووە، توخوا شیاوی منە شوێنی تۆ بگرمەوە؟ هەتا ئەگەر چێشت لێنەریش چێشتی چێ نەکردبێ، بۆ کاهین نییە واز لە دەفرو قاپی هاونشینانی پاشا بێنێو تخوونی مەنجەڵی مجێورو سواڵکەران بکەوێ.

دواتر، دەربڕینی **(گۆڕینەوەی قاپو هیرباری هاونشینانی پاشا بە مەنجەڵی مجێورو سواڵکەران)** بە کاردێت بۆ کەسێ، کە کاری خۆی جێ بێڵێو خۆی لە کاروباری خەڵکی تر هەڵقورتێنێ، یان کاری خەلکی تر رابگرێو بوەستێنێ.

# (٦١)

# هەردوو دەست وەڵامی دڵ دەدەنەوە



ئەم سەربردەیە لە بیروباوەڕی ئاسمانی (زوانگ زی) وەرگیراوە.

فەرمانڕەوا (هوان من کی) لە باغەکەدا دەیخوێندەوە، کاتێك وەستای گالیسکە هات، کە لەوێ کاری دەکردو گالیسکەی چاك دەکردەوەو پرسیاری کرد لەبارەی ئەوەی کە چی دەخوێنیتەوە.

فەرمانڕەواش پێی گوت.

وەستایەکە گوتی:

– ئەوەی تۆ دەیخوێنیەوە، لە میراتی پیاوە مردووەکان گرنگتر نییە.

فەرمانڕەوا تووڕە بوو، داوای لێکرد ئەمە روون بکاتەوە، ئەگەر نا لە داری دەدا. وەستایەکە گوتی:

– من لە کارەکەی خۆم راستیم ناسیوە، توانای بەکارهێنان لە دروستکردنی پێچکەی گالیسکە دەبێ دروست بێ، ئەگەر نا پێچکەکان وەك پێویست ناڕۆن، بەلام هێزو توانای پوختو روون چییە؟ من لە دڵەوە هەستی پێدەکەمو دەستەکانم لێی وەردەگرنەوەو ناتوانم بە وشە دەریببڕم. بۆیە ئەو جۆرە لە هەڵێنانو سووسە کردنە ناتوانم بۆ کوڕەکەم بگوازمەوەو ئەویش ناتوانێ ئەوە لە من وەرگرێ. پێشینەکان مردنو هەموو ئەو هەستانەی کە دەرنەبڕدرابوون لەگەڵ خۆیانیان بردو لەگەڵیان مردن، لەبەرئەوەیە دەڵێم ئەوەی دەیخوێنییەوە بەرماوەی بەجێماوی ئەوانە.

لەوەبەدوا، دەربڕینی هەردوو دەست وەلامی دڵ دەدەنەوە، بۆ وەسفی ئەزموونی دەوڵەمەندو وەستاییو لێبڕاویو کارکردن بە ئاسانی بەکاردێت.

ئەم دەستەواژەیە لە هەقایەتە میللییەکانو ژیاننامـەی (زومایـشن) ی مێـژووی بنەماڵەی (هان)ی فەرمانڕەوا وەرگیراوە.

(زومایشن) لە هەڕەتی گەنجێتیدا گەلێك نەدار بوو، نانی ئیلەڵلاَی نـەبوو، دوای ئـەوەی زانـی کـە ئاینـدەی نـەما، وازی لـە ژنەکـەی خـۆی هێنـا. دواتـریش بـووە خاوەنی سەروەتو سامانێکی زۆر، وایلێهات بووە فەرمانڕەوای دەڤەرەکەی خۆی.

جارێکیان چاوی بە کۆنە ژنەکەی خۆی کەوتـەوە، کـە لـە رێگـا لەگـەڵ مێـردی دووەمی دابوو، ژنە داوای لێکرد کە وەریبگرێتەوە، بەڵاَم (زومایشن) هەنـدێ ئـاوی رشتە سەر عاردو پێی گوت:

- ئەگەر توانیت ئاوەکە هەڵگریتەوە، دەتوانین وەکو ژنو مێرد بگەڕێینەوە.

دوای ماوەیەکی کەم، ژنە خۆی کوشت.

لەوەبـەدوا، ئـەم دەربڕینـە بـۆ کارێـك، یـان بڕیارێـك، کـە پاشـگەزبوونەوەو گەڕانەوەی بۆ نەبێ، بەکاردێت.

فەرمانبەرێکی گەورە لـە سـەردەمی زنجـیرەی (هـان)ی فـەرمانڕەوا هـەبوو، نـاوی (هان ئینگۆ) بوو، سەرەڕای دەسکەوتە گەورەکانی، بەلاّم لەبەر ئیهانـەکردن بەنـد کرا. بەندییەوانەکە زۆر بە رەقی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بەندییە تازەکاندا دەکرد.

(هان ئینگۆ)ش هۆشداری دایێ و گوتی:

– ئەدی نازانی پشکۆی دامرکاو هەر دەگەشێتەوە؟

(تیان جیا) وەلاّمی دایەوە:

– ئەگەر گەش بووەوە، منیش پەلامیزێکی پێدا دەکەمو دەیکوژێنمەوە.

دوای ماوەیەکی کەم، (هان ئینگۆ) لە زیندان ئازاد کراو جـارێکی تـر گەڕایـەوە سەر پلەو پایە مەزنەکەی.

لەو کاتە، (تیان جیا) لە ترسان هەلاّت، (هان ئینگۆ) هەرەشەی لە سێدارەدانی هەموو خانەوادەی بەندیەوانەکانی کرد، ئەگەر (تیان جیا) نەگەڕێتەوە. بۆیە (تیان جیا) خۆی تەسلیم کردو داوای لێخۆشبوونی لێ کرد.

(هان ئینگۆ)ش پێکەنیو پێی گوت:

– هەقی تۆڵەی منت هەیە؟

دواتر زۆر بە چاکی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کرد.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **پشکۆی دامرکاوە**، جارێکی تر دەگەشێتەوە، بـەکاردێت، بۆ وەسفی کەسێك، یان کێشەیەك کە دیارە بـەزینی پێـوە دیـارە، بـەلاّم جـارێکی دیکە بەهێز دەبێتەوە.

## (٦٤)

# گۆڕینەوەی پەرەمووچ بە شمشێر



ئەم هەقایەتە لە مێژووی زنجیرەی فەرمانڕەوایی (هان)ەوە وەرگیراوە.

بان چاو (٣٢–١٠٢ ز) کابرایەك بوو لە خانەوادەی مێژوونووسان، هێشتا لە هەرەتی گەنجێتی دابوو، کە باوکی کۆچی دوایی کرد. خانەوادەکەشی زۆر دەستکورت بوون، ناچار بوو وەك نووسەرێك لە حکومەت کاری دەکرد تا لوقمە نانێك بۆ دایکی دابین بکات.

جارێکیان پەڕەمووچەکەی هاویشتو بە ئاخ هەڵکێشانەوە گوتی:

– پیاوی راستەقینە شیاوی ئەوە نییە ئاوات و خواستی هەبێ، تا خۆی نەگەیەنێتە (فوجیزیو زانگ کیان)و شەرەفی بەدەستهێنانی زەوییەکانی رۆژئاوا بەدەستبێنێو ببێتە خاوەنی نازناوی خانەدان. ئاخر چۆنو هەتاکەی لە نێوان رایەخی نووسینو مەرەکەبدان هەر خەریك بمو بەردەوام بم؟

دواتر وەك نێردراوێك بۆ ناوچەی رۆژئاوایان نارد، توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێو پەنجا میرنشین بخاتە بن دەستی ئیمپراتۆری (هان)، پاشان وەك فەرمانڕەوای ناوچەی رۆژئاوا داندراو نازناوی (مارکیز دینگ یوان)ی بەدەستهێنا.

لەوەبەدوا، ئەم دەربڕینە بۆ وەسفی کارێك بەکاردێت کە دواتر پلەو پایەی مەدەنی وەلاوە بنێو خۆی بئاخنێتە نێو سوپا.

## (٦٥)

# پێویستە بچیتە لانەی پڵنگ، تا بەچکەکانی بدۆزیتەوە



ئەو کاتەی (بانچاو) بۆ ناوچەی ڕۆژئاوا نێردراوبوو، جارێکیان لەگەڵ سی و شەش لە پیاوەکانی، ڕۆیشتە سەردانی پاشای شانشان. پاشایش توانایەکی گەورەی هەبوو، کە نێردراو بەخۆ بەو ئاپۆرایە خەڵکە گەیشتنە لای(کسیۆنگنۆ)، پاشا بە ساردو سڕی هەڵسوکەوتی لەگەڵ (بانچاو) کرد.

(بانچاو) زانی کە خۆیو کارەکەی لە مەترسیدانە، بۆیە بەپەلە نەخشەی پلانێکی دانا:

شەوێ لە هیکەوە هێرش دەکەنە سەر خێوەتگای (کسیونگنو)، زەنگی ئاگادارکردنەوە لێدەدەنو ئاگر لەناو خێوەتەکە هەڵدەکەنەوە، کە (کسیۆنگنو) بەترسو لەرزەوە دێتە دەر، یەکسەر سەری لە لاشەی جیا دەکەنەوە. کە پیاوەکانی لەم شێوە پلانە سەرگەرمییە ئاگادار دەکردەوە، (بانچاو) گوتی:

– چۆن دەتوانن بەچکەکانی پڵنگتان دەستکەوێ، بێ ئەوەی یەکەم جار بچنە ناو لانەکەی؟

بەم شێوەیە، پلانەکەیان جێبەجێ کردو خێوەتەکەی (کسیۆنگنو)یان ئاگر تێبەرداو سەرکەوتن بە دۆستایەتی کردنی پاشای شان بۆ ئیمپراتۆری هان.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **(پێویستە بچیتە لانەی پڵنگان، تا بەچکەکانی بدۆزیەوە)** ئاماژەیە بۆ ئەوەی هیچ پرۆژەیەکی گەورە، بە بێ هەندێك سەرەڕۆیی و جەربەزەیی، سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ.

ئەم هەقایەتە لە ژیاننامەی خودیی (مایوان)، لە مێـژووی زنجـیرەی (هـان)ەوە وەرگیراوە.

مـایوان (١٤پ.ز– ٤٩ دوای. ز) ئەفـسەرێکی فەرمانـدار بـوو، دەیـان سـاڵی لـە سەرپەرشتی کردنو هێرشە سـەربازییەکان بەسـەر بردبـوو، کـە گەیـشتە تەمـەنی شەسـتو دوو سـاڵی، ئیمپراتـۆری رازی کـرد، کـە رێگـای پـێ بـدا، جـارێکی تـر فەرماندەی سوپا لەناو شەڕگا بگرێتە ئەستۆو گوتی:

– پیاوی راسـتەقینە، شـایانی ئەوەیـە لـە شـەڕدا بمـرێو بـە کفنـی پاڵـەوانان بنێژرێ، لە جیاتی ئەوەی تا مـردن، لەسـەر سیـسەمێ لـەکن کـوڕو کـچانی لـە گیانەلاّ دا بێ.

راستیەکەش هەر وابوو ساڵی پاشی، لەکاتی جێبەجێ کردنی کارەکانی لەشـەڕدا، مرد.

لەوەبـەدوا، دەربڕینـی کفنـی پاڵـەوانان، ئاماژەیـە بـۆ مرۆڤێکـی پاڵەوانانـە لـە شەڕگەدا، یان تا ئاخیری، وەکوو قیرو بنیشت بە پلەو پایەیەکەوە بنووسێ.

(٦٧)

# فاڵچییەکی چکۆلە، لەبەرامبەر جادووگەرێکی مەزن



ئەم هەقایەتە لە مێژووی سێ میرنشینەکە وەرگیراوە.

لە کۆتاییەکان سەردەمی فەرمانڕەوایی (هـان)ەکـان، دوو نووسـەری بـەهرەدار هەبوون، ئـەوانیش (زانـگ هـۆنگ) و (چـین لـین) بـوون، هـەردووکیان ڕێزێکـی زۆر گەورەیان لە بەهرەو بەرهەمە ئەدەبییەکانیان بەدەست هێنابوو.

جارێکیان (زانگ هۆنگ) نامەیەکی بۆ (چین لین) نووسـی، تێیـدا سەرسـوڕمانی خۆی بە بەهرەی ئەدەبیی ئەو دەربڕی بوو.

(چین لین)یش وەڵامی دابوویەوە، نووسیبووی:

– بەراوردکرنی ئەو لەگەڵ زانگ هـۆنگ، وەك فالـچییەکی چـکۆڵەیە لەبەرامبـەر جادووگەرێکی گـەورە، مانـای راسـتەقینەی ئەمـەش ئەوەیـە جادووگـەری چـکۆلە ناتوانێ جادووییەکی تەواوو کاریگەر لەبەردەم جادووگەری گەورە ئەنجام بدات.

چین لین، ئەم دەربڕینەی بۆ ئەوە بەکارهێنا، کە کارە ئەدەبییەکانی ئـەو، زۆر کەم بەهاترن لەچاو کارەکانی زانگ هۆنگ و ناتوانن شان لەشانی ئەو بدەن.

لەوەبەدوا، ئەم دەربڕینە، بۆ بەراوردکردنی دوو شـت بـەکاردێ، کـە یـەکێکیان لەچاو ئەویتریان زۆر سەرکەوتووتر بێ.

(لیـانگ هـۆنگ) بیرمەنـدێکی سـەردەمی رۆژهـەڵاتی (هـان) بـوو، لـە هـەرەتی گەنجیدا چەندی بلێی دەست کورت بوو، بە بەراز بەخێوکردنیً لوقمە نانێکی پەیدا دەکرد، ژنێکی رۆشنبیری بووە هاوسـەری، کـە نـاوی (میـنگ گـوانگ) بـوو، دواتـر هەردوکیان بۆ کاسبی چوونە ویلایەتی (وو)، لەویً، (لیانگ هونگ) بۆ دەسکەوتنی ژیـانی خـۆی، برنجـی بـۆ ئـەوانی دی توێکـڵ دەکـرد، هـەر کاتێـك کـە بـۆ مـاڵ دەگەڕایەوە، (مینگ گوانگ) بۆ نیشاندانی رێزو حورمەت، سەری بۆ هاوسەرەکەی کەچ دەکردو سینییەکەی لە راست بەراستی برۆیەکانی دادەنا.

بەو شێوەیە، دەربڕینی **هەڵگرتنی سینی لە راست بە راستی برۆیەکان**، بۆ دوو هاوسەر بەکاردێن، کە هەردووکیان یەکتریان خۆش بویًو رێزی یەکتر بگرن.

جارێکیان (کاوکاو)ی پاشای (وی)، بەرەبەری ئەوە بوو کە پێشوازی نوێنەری هـۆزی (کـسیونگنو) بکـات، لـەبارەی ئـەوە کـە کاریگەرییـەکی زۆری لەسـەر نوێنەرەکە هەبێ گومانی لێ پەیدابوو. بۆیە داوای لە یـەکێك لـە یاوەرانی کـرد کـە خۆی وا دابنێ پاشایەو خۆیـشی لـە نزیـك تـەخت بوەسـتێو شمـشێرێکی کـەوانی گەورەش هەڵبگرێ.

دوای دیدەنییەکە، کاوکاو، سیخوڕێکی ناردە لای نوێنەرو لیی پرسی:

=رات بەرامبەر پاشای وی چۆنە؟

نوێنەرەکە وەڵامی دایەوە:

– پاشای وی لەدانیشتنێکی شـکۆدارو شـۆقداردا ئاشـکرا دیـاربوو، بـەڵام ئـەو کابرایـەی لـە نزیکـی وەسـتابووو شمـشێرێکی بەدەسـتەوە بـوو، ئـەوە پاڵـەوانی راستەقینە بوو.

کە ئەمەی بیست، کاوکاو بۆ کوشتنی، زەلامێکی نارد تا لەپشتەوەرا بیکوژێ.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **شمشێر هەڵگرتن**، ئاماژەیە بۆ نووسین بە ناوی کەسێکی دیکە.

( ٧٠ )

# هەموو داوایەکە بۆ بای ڕۆژهەڵاتە



ئەم دەربڕینە، لە هەقایەتی سێ میرنشینەکە وەرگیراوە.

لـە بـەهاری سـاڵی ٢٠٨ دا، (کاوکـاو) فەرمانـدەیی سـوپایەکی گـەورەی لـە هێرشێکی باشووردا کرد. لەسەر کەرتی رۆژئاوای رووباری یانگتزی، حەشاماتێکی زۆری سوپایەکانی هاوپەیمانیی (سوان کوان)و (لیوبی) خڕبووبوونەوە، نەخشەیان داڕشـت بـە پـاپۆڕە جەنگییـەکان هێـرش ببەنـە سـەر کەشـتییە جەنگییـەکانی (کاوکاو).

دوای ئـەوەی لـە هـەموو ئامادەکارییـەکانی هێـرش بـردن بوونـەوە، بـەبیریان هاتەوە، کە بـای بـەهاران هەمیـشە لـە بـاکووری رۆژئـاواوە هەڵـدەکاتو وادەکـات ئاگری پاپۆڕەکان بـەرەو کەشـتییەکانیان بـچێتەوە. بـەو شـێوەیە، تـا هێرشـەکە بەدەست بهێنرێ، حەوجێتییەکە بە بای رۆژهەڵاتە.

(زۆج لیانگ)ی راوێژکاری سەرەکی (لیوبی) گوتی:

—ئەو دەتوانێ داوای هەڵکردنی بای رۆژهەڵات بکات، ئەمەشی بە فـرتو فێڵێـك ئەنجام دا، سەرەنجامیش وابوو، کەشتییەکانی کاوکاو سووتانو بوونە خۆڵەمێش.

دواتر، دەربڕینی هـەموو داواکـە بـۆ بـای رۆژهەڵاتـە، بـۆ وەسـفی ئـەو رەوشـە بەکاردێ، کە هەموو شتێکی تێدا ئامـادەو رێکخـراوە، تـەنیا ئـەو شـتە بنەرەتییـە نەبێ، کە دەسکەوتەکە بەدەست دێنێ.

## (٧١)

# دەڵێی قوڵنگە لەنێو مریشکان دا



جارێکیان، کابرایەك بە (وانگ رونگ)ی گوت:

– دوێنێ (جێ شاو)م لەنێو کۆمەڵە خەڵکێك دیت، دیاربوو، وەك قولنگی نێو مرشکان، زۆر لموزی خۆی بڵند کردبوو.

(وانگ رونگ)یش وەڵامی دایەوە:

–دیارە باوکەکەیت نەدیبوو؟ ئەویش کوڕی باوکی خۆیەتی. مەبەستی لەوە باوکی (جی شاو)بوو، کە ناوی (جی کانگ) بوو، زۆر لە کوڕەکەی لموز بڵندتربوو.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**دەڵێی قولنگی نێو مریشکانە**) بۆ وەسفی کەسێك بەکاردەهێنرێت کە لە رووکەشدا زۆر تڕ گەورەو خۆبەزل زانو قەپۆز بەرز بێ، یان بۆ هەبوونی تاکە بەهرەیەکی کەسێك لەنێو ئاپۆڕایەکی خەڵکدا.

## ( ٧٢ )

# من زۆر کەیفخۆشم، کە (شۆ)م هەر بە بیر نەماوە



لە ئاخرو ئۆخری سەردەمی سێ میرنشینەکە، شانشینی (شۆ) مل کەچ ببووو (لیوچان)ی فەرمانڕەوایەکەیان خۆی تەسلیم کردبووو بۆ (لویانگ)ی پایتەختی شانشینی (وی) بردرابوو.

(سیمازاو) ی فەرمانڕەوای (وی)، زیافەتێکی لەسەر شەرەفی (لیوچان) رێك خستبوو، لەو میانەدا سوور بوو لەسەر ئەوەی کە (شۆ) ییەکان دەست بە سەماکردنو مۆسیقاژەنین بکەن، هەموو خێزانی (شۆ) ییەکان بەوە نیگەران بوون، تەنیا (لیوچان) نەبێ.

دواتر، (سیمازاو) پرسیارێکی لە (لیوچان) کردو، ئەویش ئەوەبوو گوتی:

– غەریبی نیشتمانی خۆت نەکردووە؟

لیوچانیش گوتی:

– من زۆر کەیفخۆشم، بەجۆرێك (شۆ)م هەر لە خەیاڵدا نەماوە.

لەوەبەدوا، دەربڕینی زۆر دڵخۆشم بە جۆرێك (شۆ)م هەر بەبیر نەماوە، بۆ کەسێك بەکاردێ، کە مژووڵی ئاهەنگو کەیفو سەفا بێو خاكو نیشتمانی خۆیو ئەرکەکانی خۆی لەبیر بکا.

## (٧٣)

# مەرایی نەکردن لەبەرامبەر پێنج داوییە[٢] برنجان



[٢] داوی: یەکەیەکی پێوانەیە لە چیندا.

ئەو سەروەختەی کە تاویوانمینگ (٣٦٥–٤٢٧) شاعیری شانشینی چین بوو، ئەوسا کەسێکی گەنج بوو، لە هەرێمی (بنگزی) بە قازی دامەزرا، بەڵام زۆری لەو پۆستە دەوام نەکرد، کە فەرمانبەرێکی گەورە بۆ چاودێری کردن هاتە ناوچەکە.

یاریدەدەری (تاویوانمینگ) زۆری لێکرد کە دەستو بردێکی بکاو پۆشاکێکی باش بپۆشیٚو بۆ بەخێرهێنانی مێوانەکەی بچێتە ئاقاری. بەڵام تاویوانمینگ ئاوا وەڵامی دایەوە:

– من بۆ پێنج داویە برنجان، جلی رەسمی لەبەرامبەر ئەو کابرایە ناپۆشمو، مەراییو مامەحەمەیی بۆ ناکەم ، ئاماژەیە بۆ مووچەکەی وەك فەرمانبەرێکی گەورە.

رۆژی پاشی، مۆری رەسمی تەسلیم کردەوەو گەڕایەوە ماڵی خۆی.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (مەرایی نەکردن لەبەرامبەر پێنج داویە برنجان) بەکاردێت، بۆ وەسفی کەسێکی نموونەیی وا کە بۆ بەدەستهێنانی پارەو پوول خۆی سووكو چرووكو ریسوا نەکات.

ئـەم دەربڕینــە لــە هەقایەتێکـدا هــاتووە، کــە (تــاویوانمینگ) ی ســەردەمی بنەماڵەی جین (٢٦٥–٤٢٠) نووسیویەتی.

هەقایەتەکە باسـی ئـەوە دەکـا، کـە راوکـەرێك خـۆو بـەخت رێـی کەوتـە سـەر سەرچاوەی رووبارێك، لەوێ گوندێکی بینی، کە هەندێك خەڵکی لێ دەژیان، ئەوانـە بابو باپیریان لەبـەر گێـچەڵەکانی سـەردەمی کـین (٢٢١– ٢٠٦پ. ز) هـەڵاتبوون. ئـەو کەسـانە تـەواو لـە دەوروبـەریان دابڕابـوونو بـە چـباران حـەزیان نـەدەکرد هاموشۆو پەیوەندییان هەبێ.

کە راوکەرەکە گەڕایەوە زێدی خۆی، قازیی ئەو شوێنەو دراوسـێکەی خەبـەری ئەو شوێنەیان پێگەیشت، بەڵام کە چوون بە دوای ئەو گوندە نموونەییەدا بگەڕێن، نەیاندۆزییەوە.

لەوەبەدوا، هەر شوێنێك دوورو بێ گرفتو سەلامەت بوایە، ناویان دەنا زەویـی پۆخەکانی خۆخ.

( ٧٥ )

# کە کابرای تاوی دەگات، تەنانەت ئاژەڵەکانیشی بۆ بەهەشتی هەمیشەیی لەگەڵی دەچن



کە کابرای (تاوی) دەگات، تەنانەت ئاژەڵەکانیشی بۆ بەهەشت لەگەڵی دەچن.

گوتراوە، کە (کسوکسون) لەسەردەمی (جین) بوو، ئەو کابرایە هونەرەکانی جادووگەری لە خواوەندە نەمرەکان فێر ببوو، عومرێکی زۆری هەبوو، هەتا تەمەنی سەتو سی ساڵی ژیا. کە مرد، خانەوادەکەی هەموویان، تەنانەت مریشكو سەگەکانیش، بۆ بەهەشتی هەمیشەیی لەگەڵی فڕین.

لەوەبەدوا، دەربڕینی کە (**کابرای تاوی دەگات، تەنانەت ئاژەڵەکانیشی بۆ بەهەشتی هەمیشەیی لەگەڵی دەچن**) بۆ پەسنی کەسێکی بەهێزو خاوەن جەماوەرو هەروەها چۆنیەتی سوود وەرگرتنی خزمو دۆستەکانی لێی، بەکاردێت.

## (٧٦)

# دەریاكان دەبنە زەویی گۆڵە برنجان و زەویی برنجانیش دەبنە دەریا



ئەم دەربڕینەی سەرەوە لە چیرۆکەکانی نەمران وەرگیراوە.

جارێکیان (ماگۆ) بە (وانگ یوان)ی گوت:

– لەوەتەی ئێمە یەکترمان ناسیوە، بە چاوی خۆم سێ جارانم دیتووە کە دەریای رۆژهەڵات بۆتە زەوی برنجان، هەروەها ئەو کاتەی کە جاری ئاخیری بوو چوومە بەنگلای، دەریام بینی ئەوجارە بۆتە تەنکاوەك، بەجۆرێك قولاییەکەی نیوەی قولاییەکەی جاران بوو. دەترسێم جارێکی دیکە ببێتەوە زەوی برنجان.

(وانگ یوان) وەڵامی دایەوە:

– لە دانایەکم بیستووە، کە تەپو تۆز جێگای دەریا دەگرێتەوە.

ئەم دەربڕینە، بۆ گۆڕانکاریی‌و جێگۆڕکێیە گەورەکان لە جیهان‌و ژیانی خەڵك، یان تێپەڕینی کات بەکاردێت

(وانگ یوانگ)، لە بنەماڵەی جین بوو، خۆی وا حسێب دەکرد کە لە سەرووی هەموو شتە دنیاییەکانە، ئەو کابرایە قەت قەت وشەی ماڵ‌و سەروەتی بەسەر زاردا نەدەهات. ژنەکەی زۆر لەبەری بێزار بوو.

جارێکیان، کە (وانگ یوانگ) نووستبوو، کارەکەرێکی نارد، هەموو پارەو پوولی لە دەورەی ئەو لەسەر یەك دانا، وایدانا کە هەڵبستێ یەکسەر داوا لە کارەکەر دەکا ئەو پارەو پوولانە لاببەن‌و ئەو کاتە وشەی (پارەوپوول)ی بەسەر زاردا دێ. بەڵام کە (وانگ یوان) لە خەوێ هەستا، تەنیا ئەم قسەیەی کرد: (ئەو شتانەم لێ دوور بخەنەوە) ئەوسا ئەمە بووە دەربڕینێکی نێو خەڵك، چونکە ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی بەهیچ شێوەیەك وشەی (پارەوپوول)ی لە دەم نێتە دەر.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (ئەو شتانە) وەك هاوواتایەك بۆ وشەی (پارەوپوول) بەکاردێت.

لە ساڵی ٤٥٠ی دوای زایین، (شـەن کینگـزی) لـە سـەردەمی بنەماڵـەی سـونگ (٤٢٠–٥٨٩)، بووە فەرماندەی سوپای هەردوو میرنشینی باکوورو باشوور.

ئیمپراتۆر سونگ، ویـستی خـاکی (وی) هـەتا بـاکوور داگـیر بکـا. بـەڵام (شـەن کینگزی) گوتی سوپای (سونگ) باری سوپای (وی) تێ نابێ.

ئیمپراتۆر لە دوای دوو پیاوە شارییەکانی خۆی نارد، تا لەو بارەوە گفتوگۆیان لەگەڵدا بکا.

لەو کاتەدا، (شەن کینگزی) تووڕە بووو گوتی:

– دەسەڵاتی دەوڵەت وەك ماڵ بەڕێوەبردن وایە، پێویستە پرسیاری کرێکاران لەبارەی کشتوکاڵو پرسیاری کارەکەرانیش دەربارەی جۆلاّ چنین بێ...و جەنابت دەتەوێ ئێستا گفتوگۆ لەبارەی داگیرکردنی رۆژهـەلاّت لەگـەڵ ئـەم دوو بیرمەنـدە رەنگ پەڕیوە بکەی، ئەمەش پێچەوانەی عەقڵە.

لەوەبـەدوا، دەربڕینـی (هـەردوو بیرمەنـدی رەنـگ پـەڕیو) بـۆ ئـەو گەنجانـە بەکاردێت، کە زۆر لە ژیانی راستەقینە نازانن.

زوسی (٢٥٠–٣٠٥)، نووسەرێکی سەردەمی (جین)ی ڕۆژئاوا بوو، لە نووسینی هەر وشەیەکدا زۆر بەکاوەخۆ بوو. دە ساڵی پێچوو تا کتێبێکی لەبارەی سێ پایتەختەکەی وڵاتانی (وی، وشوو، ووو) نووسی، گەورە نووسەرانی ئەو سەردەم، بە چەندین شیعر ڕێزیان لێنا. ئەمە پاڵی بەو وەنا، کە کتێبەکەی لە (لویانگ)، ئەو شارەی ئەو لێی ژیا بوو، لەبەر بگرێتەوە. کاتێك کاغەز لە کۆگاکانی ئەوێ نەمان، نرخەکەی بەرز بوویەوە.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**کاغەز گرانە لە لویانگ**)، بۆ پەسنی کارێکی چاکی پوختی پڕ ڕەواج، بەکاردێت.

لەسـەردەمی ویلایەتـە شـەڕکەرەکان دا، هـەردوو ویلایـەتی (کـین‌و چـۆ) لـە ململانێیەکی لە مێژینەدا بوون، ویلایەتەکانی تر جارێك لەگەڵ ئەمـەو جـارێکی تـر لەگەڵ ئەوی دیکەدا، هاوپەیمانێتییان دەبەست. بەم شێوەیە، دەربڕینـی یارمـەتی کین لە بەیانیان‌و یارمەتی چۆ لە ئێواراندا لە وەسفی کەسێك بـەکارهات کـە هـەر جارە لەسەر پەتکێك بێ‌و خۆگۆڕو پەیمان شکێن بێ.

سەرچاوەیەکی دیکەی ئەم دەربڕینە، وتارێك بوو، کە چاوبۆری (١٠٥٣– ١١١٠) نووسەری سەردەمی سۆنگی باکوور نووسیبووی، تێیدا دەڵێ:

– دەستکەوتنی ژیان، پاڵی پێوەدەنێ بۆ یارمەتی (کین) لە بەیانیان‌و یارمەتی (چۆ) لە ئێوارەدا، ئەمەش مانای ژیانێکی پەرتەوازە بووە.

ئەم چیرۆکە باس لە (وانگ کزیری ٣٠٣– ٣٦١) ی خۆشنووسی سەردەمی زنجیرەی (جین) دەکات.

فەرمانبەرێکی رەسمی کارەکەرێکی نارده ماڵی (وانگ داو)ی سەرۆك وەزیران، بۆ ئەوەی یەکێ لە رۆڵەکانی دەستنیشان بکا، تا ببێتە زاوای ئەو. وانگ داو ئەوی لەگەڵ خۆی بردە قاوشی رۆژهەڵاتی خانووەکەی، کە چەند پیاوێکی جحێڵی لێ دەژیان.

ئەوانە کە زانیان کابرای میوان بۆ ئەو مەسەلەیە هاتووە، هەر بەپەلە پەل جوانترین جلیان پۆشیو زۆر بە شانو شەوکەتەوە قەراریان گرت، تەنیا کوڕە گەنجێك نەبێ بە جلێکی نیوە رووت لەسەر سیسەمەکەی پاڵ کەوتبوو، وەکوو ئەوە کە گوێی لە داواو داخوازی مێوان نەبووە.

کە کارەکەرەکە حارو مەسەلەی بۆ بەرپرسەکەی خۆی گێڕایەوە، هەر زوو گەنجە شەپڕێوەکەی ئاخیری هەڵبژارد تا ببێتە زاوای، لەوەش سەرکەوتوو بوو، کە بۆی ئاشکرابوو ئەو کابرایە (وانگ کزیری)ی ناودارەو برازای (وانگ داو)ە.

لەوە بەدوا، دەربڕینی **پاڵکەوتوو لە لای رۆژهەڵات**، یان ئەولای رۆژهەڵات، بۆ ئاماژەدان بە زاوا بەکاردێت.

ئـەم دەربڕینـە لـە هەقایەتـە نوێیـەکانی تایبـەت بـە رووداوە کۆمەڵایەتییـەکان وەرگیراوە.

کۆنگ رۆنگ (١٥٣– ٢٠٨) لە ناوچـەی رۆژهـەڵاتی (هـان) دەژیا. لـە بنەماڵـەی (کۆنفۆشـیۆس) بـوو، فەرمانبـەرێکی گـەورەو بیرمەنـدێك بـوو، لەگـەڵ هێزەکـانی (کاوکاو) ناکۆك بوو، دواتر دەستگیر کرا. کە دەستگیر کرا، خانەوادەکەی تووشـی ترسێکی گەورە بوون، بەڵام لای دوو کوڕەکانی، کە یەکەمیان نۆ ساڵی‌و ئـەوی تـر هەشت ساڵی بوو، نە بای دەهات‌و نـە بـاران، هـەر یـاری خۆیـان دەکـردو گوێیـان نـەدەدایێ. (کـونگ رۆنـگ) لـە سـەربازەکان پاڕایـەوە، کـە خـۆ لـە کوڕەکـانی نەگەیەنن. بەڵام هەردوو کوڕەکە بە باوکیان گوت:

– بابە ! ئایا دەبێ لە بن لانەیەکی سەرەونخون هێلکەیەکی ساغ بدۆزرێتەوە؟

بەم جۆرە هەردوو کوڕەکەیان گرتن‌و لەگەڵ (کۆنگ رۆنگ) یان سەربڕین.

بەم شێوەیە، دەربڕینـی (**لـەبن لانـەی وەرگـەڕاو، هێلکەیـەکی سـاغ نییـە**) بەکاردەهێنرێ، بۆ ئاماژەدان بەوەی کە لـە کـاتی لێـك هەڵوەشانی خانەوادەیـەك کەسی نزیکی ئەو خانەوادەیە بە خۆراگری‌و دامەزراوی نامێنێ.

لە سەردەمی (جین)دا، فەیلەسوفێك هەبوو ناوی (گوکسیانگ) بوو، ئەو کابرایە زۆر هۆگری ئەوە بوو قسە لە بابەتە فەلسەفییەکان بکات، یەکێك لە هاوسەردەمەکانی کە ناوی (وانگ یان) بوو، گوتی:

–کە گوێم لە (گوکسیانگ) شل کردبوو، ئەو قسەی دەکرد، هەست دەکەم قسەکانی تاڤگەیەکن لە وشە !

لەوەبەدوا، دەستەواژەی **تاڤگەیەك لە وشە**، بۆ وەسفی قسەکردنو دوان بە رەوانی، یان بەردەوامیی لەسەر قسە بەبێ وەستان، بەکاردێت.

روان جی(٢١٠– ٢٦٣ پ. ز) بیرمەندێکی سەردەمی سێ میرنشینەکە بوو، دەیتوانی بە سپیایەتی چاوەکانی هەروەك بیلبیلەکانی ببینێ، کە سپیاتی چاوەکانی دەردەخست بۆ بەخێرنەهێنان‌و ڕێزنەگرتنی میوانەکانی بوو، هەروەك بیلبیلە ڕەشەکانیشی دەردەخست بۆ ئەو کەسانەی کە خۆشی دەوێن‌و ڕێزیان دەگرێ.

بەم جۆرە، دەربڕینی سپیاتی چاوان، واتە گاڵتەپێکردن و تڕۆبوون و قێزهاتنەوە، هەرچی دەربڕینی **نیگای ڕەشەکان**، یان ڕەشایی چاوانە، واتای بە گەورە زانین‌و هۆگری‌و ڕێك کەوتن‌و ڕێزگرتنە.

## (٨٥)

# بەهرەکانی جەنابی جیانگ، کەشەنگ بوونە



سەیدا جیانگ هـو جیـانگ یـان (٤٤٤– ٥٠٥)، بیرمەنـدێکی سـەردەمی هـەردوو میرنشینەکەی باکوورو باشوور بـوو. ئـەو کاتـەی گـەنج بـوو، بـە نووسـینی وتـارە جوانـەکانی ناوبـانگێکی زۆری دەرکردبـوو. کـە لـە هەرێمەکەشـدا بـووە قـازی، خـــەونێکی دیـــت، لـــە خەونەکەیـــدا لای وابـــوو، فلـّــچەیەکی جـــوانی نووســـینی دەسکەوتووە. وای لێهات کارەکانی زۆر پاك‌و چاك بـوون، دوای دە سـاڵ خـەونی دیت لای وابوو: پیاوێکی جوان‌و کۆکی لێ وەدیار کەوت‌و گوتی:

– تۆ بە درێژایی چەندین ساڵە فلّچەکەی منت پاراستووە، ئێستاش دەبێ بۆم بگەڕێنییەوە.

(جیانگ یان) یش فلـّچەکەی نووسـینی بـۆ کـابرا گەڕانـدەوە، دوای ئەمـە هـیچ شتێکی هاوشێوەی نووسینەکانی پێشووی نەنووسی، خەڵکیش دەیانگوت:

–(جیانگ یان) بەهرەکەی کەشەنگ بووە.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**جەنابی جیانگ بەهرەکانی کەشەنگ بوونە**) بـۆ پـەسنی کابرایەك کە بەهرەکەی ناپاکی لەگەڵ بکاو خەیاڵی لاواز بێت، بەکاردێت.

ئــەم دوو دەربڕینـــەی ســـەرەوە، لــە هەقایەتـــەکانی ســـەردەمی زنجـــیرەی (تانگ)ەوە وەرگیراون.

کابرایــەك هــەبوو نــاوی (وی گــو) بــوو، ویــستی لەبەرامبــەر پەرســتگایەکی دیـاریکراودا بـووکی داهـاتووی خـۆی بناسـێ، لەبـەر ئـەو جـۆش‌و خرۆشـەی کـە هەیبووو شەوی پێش وادەی دیاریکراو، خەوی لێنەکـەوت، بۆیـە پـێش بەرەبـەیان گەیشتە پەرستگاکەو لـەوێ لـەژێر تریفـەی مانگەشـەودا پیرەمێردێکی بینـی کـە لەسەر قادرمەی بەردەمی پەرستگاکەدا دانیـشتبوو، جانتایـەکی سـەیرو کتێبێکـی پێ بوو. پرسیاری لەو دوو شتانە لێکرد، کابرای پیرەمێردیش وەڵامی دایـەوە، کـە کتێبەکە تۆمـاری هـەموو هاوسـەرەکانە لـە جیهـان، هەرچـی جانتایەکەشـە پـەتی سووری تێدان، کە بۆ لێك بەستنەوەی لاقی دوو کەسان بەکاردێت. هەروەها گوتی لە کاتی بەستنی پەتەکەدا، هەردوولا دەتوانن هاوسەرگیری ئـەنجام بـدەن. ئەگـەر خانەوادەکانیشیان رازی نەبن، یان هەردووکیان لە دوورەوە بژین.

پاشان پیرەمێردەکە (وی گۆ)ی دڵنیـا کـردەوە، کـە پەتـە سـوورەکە لـە لاقـی ئەوو لاقی بووکی داهاتووی دەبەسـتێ، بـەو شـێوەیە نیـشان کردنەکـە لـە هـەمان شەودا تەواو بوو، دوای ئەوە هەردوو هاوسەر بە بەختەوەری ژیان.

دواتر، دەربڕینـی **پێیـەکان بـە پـەتی سـوورەوە بەسـتراون**، ئاماژەیـە بـە دوو هاوسەری بەختەوەر، هەرچی ئەو کەسەیە کە ئیـشی هاوسـەرگیری رێـك دەخـات‌و پێناوی دەکات، ناوی **پیرەمێردی ژێر تریفەی مانگەشەوی** لێ دەنرێت.

(روان فۆ)، لە سەردەمی بنەماڵەی (جین) گەشتێکی بۆ (هۆیجی) ئەنجام دا، توورەگەیەکی هەڵگرتبوو، کە قوماشی رەشی تێدا بوو، کابرایەك لە بارەی ئەوەی کە چی لەناو ئەو توورەگەدایە، پرسیاری لێکرد.

وەلاّمی دایەوە:

– تەنها پارچە دراوێکە هاورێی توورەگەکەیە، تا توورەگەکە هەست بە شەرمەزاری نەکا لەوەی کە بەتاڵە.

دواتر، خەڵك دەربڕینی (**توورەگەی سەیدا روان شەرمەزارە**) یان, بۆ کەمی ماڵ بەکارهێنا.

ئەم دەربڕینە لە هزرێکی شاعیرانەی (مونگ کی) ی سەردەمی (تانگ ٦١٨-٩٠٧) وەرگیراوە. جارێکیان (لیویۆکسی) شاعیر، زیافەتێکی لەلایەن (سیکۆنگ لیشن) بۆ رێکخرابوو. کاتێك تاقمە کچێکی گۆرانیبێژ بۆ خۆشراگرتنی ئاهەنگەکە هاتن. (لیو) هەر زوو شیعرێکی لەسەر دانان، تێیدا ستایشی جوانی کچەکانی کرد، بەلاَم (سیکۆنگ) هیچ پێ کاریگەر نەبوو، چونکە زۆر جاری دیبوون و پێی وابوو ئەم دیمەنە دیمەنێکی ئاساییە.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**دیمەنی ئاسایی سیکۆنگ**) بۆ شتێکی زۆر ئاسایی و جیاواز نەبوو، بەکاردەهێنرێ.

ئەم دەربڕینە لە دیمەنێکی هەمەلایەنی دەسەڵاتەوە وەرگیراوە.

لـە سـەردەمی زنجـیرەی تـانگ (٦٢٤– ٧٢٥) و لـە میـانی حـوکمڕانی خانمـە ئیمپراتـۆر (وۆزیتـان)، دوو فەرمانبـەری گـەورەی زۆر سـتەمکار هـەبوون، ناویـان (زوکـسینگ)و (لای جانـشن) بـوون، هــەردووکیان وەسـتای ئـازاردانو عەزابـدانی وەحشییانە بوون.

ئەو کاتەی (زوکسینگ) بە کودەتاکردن بەسەر شۆڕشدا تاوانبـار کـرا، وۆزیتـان بە نهێنی داوای لە (لای جانشن کرد) کە دەستگیری بکات. جانـشنیش زیافـەتێکی بۆ (زۆکسینگ) رێك خستو بانگی کرد بۆ زیافەتەکەو لەو میانەدا پرسیاری ئەوەی لێکرد کە باشترین رێگا ئەوەیـە مەنجـەڵێکی ئاسـنینی باشـی زۆر گـەورە، ئـاوێکی شیرتێنی تێ بکرێو پاشان کابرای دەستگیرکراوی هەڵدرێتە ناوی.

لەو کاتەدا (لای جانشن) داوای مەنجـەڵێکی ئاسـنینی کـردو بـە (زوکـسینگ)ی گوت:

–ئەتۆ تاوانبـاری بـەوەی کـە پیلانـت بـۆ شـۆڕش لـە بـن سـەران بـووە، بۆیـە زەحمەت نەبێ بڕۆ ناو مەنجەڵەکە.

(زوکسینگ) یەکسەر دانی بە تاوانەکەی دا هێنا.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **(تکایە چوون بۆ ناو مەنجەڵەکە)** بۆ وەسفی شکستهێنانی ئەو پلانەی کە ئامانجی ئازاردانی ئەوانی ترە، بەکاردێت.

ئەم دەربڕینە لە مێژووی نوێی زنجیرەی فەرمانڕەوایی (تانگ)ەوە وەرگیراوە.

لی لولنگچی (٦٨٥– ٧٦٢) ئیمپراتۆری سەردەمی زنجیرەی (تانگ) بوو، زۆری کەیف بە مۆسیقا دەهات. دەیتوانی چەندین جۆری ئامێری مۆسیقا بژەنێو هەروەها مۆسیقاش دابنێ. سێ سەد کچو کوڕی گەنجی نێو کۆشکی هەڵبژاردو لە باغی هەڵووژان، لە (شانگان)ی پایتەختی نیشتەجێ کردن. کە ئێستا ئەو شانگانە بۆتە شاری (کسیان).

ئیمپراتۆر بە خۆی چۆنیەتی گۆرانی گوتنو ژەنینی ئامێرە مۆسیقاییەکانی فێر دەکردن، ناوی لێنابوون (قوتابییەکانی ئیمپراتۆر لە باغی هەڵووژان).

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**باغی هەڵووژە**) ئاماژە بۆ بازنەی ئۆپەرێتییە، جێبەجێ کەری ئۆپێراکەش ناوی لێنرا قوتابیانی باغی هەڵووژە.

ئەم دەربڕینە لە مێژووی سەردەمی بنەماڵەی (سۆنگ)ەوە وەرگیراوە.

لەسەردەمی بنەماڵەی سۆنگ (٩٦٠– ١٢٧٩) فەیلەسوفێك هەبوو ناوی (شاویونگ) بوو، ئەو فەیلەسووفە کابرایەکی دەست کورت بووو لە کوخێکی شڕو هوڕ و کۆن دەژیا. بەڵام زۆر لە هەژارییەکەی ئاسوودە بووو بەختەوەر دەژیا. ناوی لە خۆنابوو گەورەی ئاشتیو بەختەوەریو ناوی لە کوخەکەش نابوو لانەی گەرمو خۆش.

لەوەبەدوا، بۆ هەر ماڵێکی هێمنو ئاسوودە دەگوترا **لانەی گەرمو خۆش**.

## (٩٢)

# خەونی زێڕینی دارگەسك



ئەم دەربڕینە لە چیرۆکێکی سەردەمی زنجیرەی (تانگ)ەوە وەرگیراوە.

کوڕێکی گەنج هەبوو، ناوی (لو) بوو، جارێکیان بۆ تاقی کردنەوە ڕەسمییەکان بەرەو پایتەخت بەڕێکەوتبوو، لە ڕێگا لە میوانخانەیەك لە (هاندان) لایدا، لەوێ پیرەمێردێکی تاوی دیت، کە ئەویش ناوی (لو) بوو، گەنجەکە شکایەتی حاڵی خۆی لە دەستکورتیو سەختی گوزەرانی ژیانی، لای پیرەمێرد باس کرد، پیرەمێرد سەرینێکی لەسەر جێگاکەی خۆی بە (لو) بەخشیو پێی گوت:

—سەر بخەرە سەر ئەو سەرینەو بنوو، چی بخوازی، بۆت دێتە دی.

لەو کاتەدا چێشت لێنەری میوانخانەکە (درەختی گەسك) ی لێدەنا. کوڕە گەنجیش سەری خستە سەر سەرینەکەو خەوی لێکەوتو خەونی دیت، لە خەونەکەیدا لای وابوو، کچێکی جوان و دەوڵەمەندی خواستووە. دواتر گەورەترین بڕوانامەی ئەکادیمی بەدەست هێناو دوای زنجیرەیەك پیشکەوتنو پێگەیشتنی خێرا، بووە سەرۆك وەزیران، تا دە ساڵان لەو پلەو پایەیەدا مایەوە. پێنج منداڵی لەو ژنە بوونو هەموویان گەیشتنە پلەو پایەی گەورەو دوازدە نەوەی هەبوونو هەر یەك لە کوڕو نەوەکانی لە خانەوادەی خانەدان ژنیان خواست، ژیانێکی درێژو بەختەوەری بردە سەر کە زیاتر لە هەشتا ساڵ بوو.

بەڵام کە لە خەوەکەی بە ئاگا هاتەوە، دیتی گەڵا گەسکەکە هەر لەناو مەنجەڵەو لەسەر ئاگر وا دەکوڵێ، لە خۆی پرسی:

— ئایا ئەمە هەمووی خەون بوو؟

پیرەمێردەکە پێکەنیو گوتی:

— ئەمە ئەو شتانەن لەم جیهانەدا.

لەوەبەدوا، دەربڕینی خەونی زێڕینی درەختی گەسك بۆ بەهەڵم بوونی گومانو خەیاڵەکان بەکاردێت.

ئەم دەربڕینە لە هەقایەتێکی سەردەمی زنجیرەی تانگ، بەناوی هەقایەتی (نان کی تایشۆ) وەرگیراوە.

(شۆنیۆفین) لە سالڕۆژی لە دایك بوونیدا لە (گوانگلینگ) سەرخۆش بوو، لەبن پیرەدرەختێکی گەورە، کە ئەو دارە شوێنی دەرس خوێندنی قوتابیان بوو، لێ کەوتە خەوێ. خەونێکی دیت، لەو خەوەیدا لای وابوو، کە سەفەری بۆ شانشینی پیرۆزی (هوایان) کردووەو لەوێ لەگەڵ کچی پاشا زەماوەندی کردووەو دواتر بۆ ماوەی بیست ساڵ لە نانکی (کەدەداری باشوور) فەرمانڕەوا بووە، دوو کچو پێنج کوڕو سەروەتو سامانێکی زۆری دەستکەوتو پلەو پایەیەکی گەورەی بەدەست هێنا. دواتر سەرکردایەتی سوپایەکی دژی دوژمنانی شانشین کرد، بەڵام شکستی هێنا، دوای ئەوە بۆ ماوەیەکی کەم، ژنەکەی مردو لەسەر کارەکەیان لاداو شاربەدەریان کرد.

کە لە خەوەکەی بەئاگا هاتەوە، خزمەتکارەکەی گەسکی لێدەداو رۆژ زۆر بەتینی لە سەری دەداو شەرابەکەش هەر لە شوێنی خۆی لەناو کاسەکەدایە. تەماشای دامێنی درەختەکەی کردو دیتی لەبن کەدی ژێرەوە، پڵنگ کونێکی لێداوەو کردوویەتییە لانە. خەونەکەی بەوە دی بوو، کە پێی وابوو شانشینی پیرۆزی هوایانە!

لەوەبەدوا، دەربڕینی **خەونی کەدەداری ژێری**، ئاماژەیە بۆ خەونێکی خۆشو دڵخۆشییەکی بە هەڵەداچوو.

## (٩٤)

# قازییەکان ئاگر دادەگیرسێنن، بەڵام خەڵك چرایەکان هەڵناکەن



لەسەردەمی زنجیرەی (سۆنگ)، لە ویلایەتی (بیان) قازییەك هەبوو، ناوی (تیان دنگ) بوو، ئەو ناوە لە خەڵکی تر قەدەغە بوو، ئەو پیاوە هۆشداری دایە خەڵکی ئاسایی، کە دەبێ کاتێك ناوی چرا دێنن، لە جیاتی چرا بڵێن ئاگر.

کە وادەی ئاهەنگی چرایەکان نزیك بوویەوە، لە رۆژی پازدەی مانگی چواری قەمەری، دەسەڵاتە خۆجێیەکان رایانگەیاند، کە بە بۆنەی ئەم ئاهەنگەوە هەموو کەس بۆی هەیە چرا دابگیرسێنێ، ئەگەر چی چرا قەدەغەیە، بەڵام دەتوانن لە جیاتی وشەی چرا، وشەی ئاگر بەکاربێنن.

لەبەرئەوە، لە ئاگادارییەکەدا هاتبوو:

– بە پێی داب و نەریت، لەم ویلایەتەدا دەشێ ماوەی سێ رۆژان ئاگر دابگیرسێ.

لەوەبەدوا، دەربڕینی **قازییەکان ئاگر دادەگیرسێنن، بەڵام خەڵکیش چراکانیان پێناکەن**، بە واتای ئەوە بوو کە چینی دەسەڵاتدار مافی ئەوەی هەیە بە هەر جۆرێك سەرپێچی بکات، بەڵام رێگا بە خەڵك نادرێ تەنانەت مومارەسەی چالاکییە ئاساییەکانی خۆیشیان بکەن.

ئەم دەربڕینە لە ژیاننامەی (سودان) لـە مێـژووی سـەردەمی بنەماڵـەی (جـین) وەرگیراوە.

جارێکیان فەرمانبەرێکی گەورە، خەونێك دەبینێ، لە خەونەکەیدا لای وایـە کـە لە بەرامبەر گۆمە ئاوێکی بەستوو راوەستاوەو قسە لەگەڵ کەسێك دەکا، کـە لـە ژێر شەختەکە دایە. ئەو فەرمانبەرە داوای لـە (سـودان) کـرد، کـە عـاریفێکی ئـەو سەردەمە بوو، خەوەکەی بۆ لێك بداتەوە.

سودانیش بە فەرمانبەرەکەی راگەیاند، کە ئـەوەی سـەر شـەختەکە (یـانگ)ەو ئەوەی ژێر شەختەکەش (یـین)ە، قسەکردنیـشی لـەو دیـوو ئەمـدیوی شـەختەکە، واتە گفتوگۆ لە نێوان (یانگ)و (یین).

ئــەم خەونــە، خــەونێکی باشــە، چــونکە فەرمانبەرەکــە دەبێتــە رێکخــەری **هاوسەرگیری**، کە شەختەکە توایەوە، **هاوسەرگیرییەکە** دێتە دی.

سەرەتا فەرمانبەرەکە لەم لێکدانەوەیە بە گومـان بـوو، بـەڵام دوای ماوەیـەکی زۆر کەم، داوای لێکرا کە بووکێك بۆ کـوڕی فـەرمانڕەوای ئـەو شـوێنە بدۆزێتـەوە. چـــی داوا لێکرابـــوو، کـــردی. وەك ئـــەوەی ســـودان پێـــشبینی بـــۆ کردبـــوو، **هاوسەرگیرییەکە** لە بەهاردا، دوای توانەوەی بەفرەکە رێك کەوت.

لەوەبەدوا، پاشان ناوی (**پیاوی بەفر**) بۆ ئەو کەسانە داندرا، کە ئیـشی خێـرێ (**هاوسەرگیری**) رێك دەخەن.

(کین هۆی) سەرۆك وەزیرانی دەسەڵاتی باشووری سۆنگ (١١٢٧– ١٢٧٩) بوو، جارێکیان لەگەڵ ژنەکەی، لە ژێر پەنجەرەی رۆژهەڵاتی خانووەکەیان پیلانێکیان بۆ کوشتنی ژەنەڕاڵ یۆفای رێك خست، وابوو یۆفای و کوڕەکەیان کوشت.

دواتر، دوای ماوەیەکی کەم لە مردنی (کین هۆی)، کوڕەکەیشی مرد، بێوەژنەکەی تەرمێکی بۆ یادکردنەوەی هەردووك (کوڕو باوك) دانابوو. رۆحەکانی بۆ جیهانەکەی تر رەوان کرد. لەوێ جادووکارێك کین هوی و کوڕەکەی بینی و لە پیلانەکە بۆ کوشتنی (یو) و کۆتو بەندکردنی گشتیان بە زنجیر، لەگەڵیان دابوو. ئەو کاتە (کین هوی) بە جادووکارەکەی گوت:

–توخوا تکات لێدەکەم برۆ هەواڵ بدە ژنەکەم، کە پیلانی پەنجەرەی رۆژهەڵات تەواو ئاشکرا بوو.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (**پیلانی پەنجەرەی رۆژهەڵات**) ئاماژەیە بۆ ئاشکرابوونی پیلان.

(جیاداو) شاعیرێکی سەردەمی (تانگ) بوو، جارێکیان سواری گوێ درێژێك ببوو، شیعری بۆ خۆی دەگوت، لە ڕێگادا ئاگای لە خەڵك نەمابوو، بەوەوە خافلاً بوو، کە دوو دێری لە یەکێك لە شیعرەکانی بە منجەمنج گوت:

**چۆلەکەکان لە نزیك گۆمە ئاوێك، لەسەر دارەکان نیشتنەوە**

**گوێ درێژەکە لەبن تریفەی مانگەوە لە دەرگای دا.**

لە هیکەوە، وایدانا، کە پێویستە وشەی لە دەرگا دەدا، بە وشەی پاڵدەدا بگۆڕێ، بەلاّم سەری لەم بیرەی سوڕما بوو، هزری هێناو برد، بیری لە جوڵەی لە دەرگادانو پاڵدان کردەوە، کەرەکە ڕێگاکەی بزر کرد، بەرەو لای کاروانی قازیی پایتەخت چوو، کە ناوی (هان یو) بوو، ئەم قازییە بیرمەندو نووسەرێکی بەناوبانگ بوو، یەکسەر پاسەوانەکانی، (جیاداو)یان دەستگیر کردو بردیانە بەردەم (هان یو).

(جیاداو)یش گرفتەکەی خۆی سەرو بن بۆ (هان یو) گێڕایەوە، (هان) یش بۆ ماوەیەکی درێژ بیری کردەوە، پاشان بە (جیاو)ی گوت:

وشەی (کیاو) واتە (ڕێگا) باشترە.

بەم بۆنەیەوە هەردووکیان بوونە دوو دۆستو برادەری خۆشەویست.

لەوە بەدوا، دەربڕینی (پاڵدە، لێبدە) بۆ بیرکردنەوەیەکی دوورو درێژ بەکاردێت.

(٩٨)

# گەڵا سەوزەکان، سێبەرێکی خۆشییان لێ بەرهەم دێ



دومو (٨٠٣– ٨٥٢) ی شاعیری سەردەمی تانگ، جارێکیان چووە ویلایەتی (هو). لەوێ چاوی بە پیرەژنێك کەوت، کە کچێکی جحێڵی شۆخو شەنگی لەگەڵ بوو.

(دومو) گرەوی لەگەڵ پیرەژنەکە کرد، کە تا دە ساڵان با ئەو کچە چاوەڕێی بکات، دوای ئەوە ئەگەر بۆ هاوسەرگیری نەهاتەوە لای، ئەوا کچە دەتوانێ مێرد بە یەکێکی تر بکات. (دومو) بڕە پارەیەکی زۆری وەك دیاریو مارەیی دایە پیرەژنو ڕۆیشت.

بەڵام چواردە ساڵ تێپەڕین بێ ئەوەی بگەڕێتەوە، کە گەڕایەوە، کچە پێش سێ ساڵ بوو شووی کردبوو، دوو کوڕیشی بووبوون. شاعیرەکە بەم ڕووداوە زۆر نیگەران بوو، شیعرێکی بە ناوی (پەرۆشی جیابوونەوە) نووسی:

**لە گەڕانم بە دوای بەهاردا زۆر دواکەوتم**
**لە وەرزی گەشاوەدا، پێویست بە وەڕەسیو نیگەرانی ناکا.**
**بایەکان رەنگێکی قورمزیی تۆخیان گرتووە**
**گەڵا سەوزەکان ئێستا سێبەرێکی نەرمو خۆشیان لێ بەرهەم دێ.**
**لقە دارەکانیش میوەیان لە خۆ هەڵداوە.**

لەوەبەدوا، دەربڕینی (گەڵا سەوزەکان سێبەرێکی نەرمو خۆشیان لێ بەرهەم دێ) لە پەسنی ژنێك بەکاردێت، کە شووی کردبێو ژمارەیەك منداڵی هەبن.

هۆنگنیـانگ، ئەکتـەرێکی نێـو شـانۆگەری (چـیرۆکی ژووری رۆژئـاوا) بـوو، ئـەم بێوەژنە، وەك فەرمانبەرێکی گەورە لەگەڵ کچێكو کوڕێکی لە پەرستگایەك دەژیا. بیرمەندێکی گەنج کە ناوی (زانگ کونگ) بوو، پاڵەوانی چیرۆکەکەیەو لـە ژوورێکـی لای رۆژئاوای هەمان پەرستگادا دەژیا. جارێکیان (زانك گـونگ) لـەناو پەرسـتگادا، چاوی بە (کوی یەنکینگ)ی کچی بێوەژنەکە کەوت، یەکسەر شەیدای بوو.

کابرایەك پیشەی تەنیا خراپەکاری بوو، گوێ بیستی جوانی ئەو کـچە بـوو، بـە پێش جەماعەتەکەی خۆی کەوتو سەرکردایەتی کردن، تا پەرستگاکە گەمارۆ بداو رایگەیاند کە ئەو دەیەوێ لەگەڵ (یەنگینگ) زەماوەند بکا، ئەگەر نا هەرچی لـەناو ئەو پەرستگایەیە یەکێکی بە پێوە ناهێڵێ.

بێوەژنەکە گوتی: هەر کەسێك بتوانێ یەنگینم لـەو تاوانبارەیـە بـۆ رزگـار بکـا، ئەوا لێی مارەدەکەم. (زانگ گۆنگ) نامەیەکی بۆ ژەنەڕاڵێکی برادەری نووسی، کە لە ناوچەیەکی دراوسێی ئەو بوونو داوای یارمەتی لێکرد.

ژەنەڕاڵیش فەرماندەی سوپاکەی کرد، تا ئەم کچە رزگار بکەنو تاوانبارەکەش دەستگیر بکەن، وابوو هەموو گەماڕۆدراوەکانی ناو پەرستگاکەی ئازاد کرد.

بەڵام بێوەژن لە بەڵێنەکەی پەشیمان بوویەوەو رەتی کردەوە کـە (یـەنگینگ) لە (زانگ گـونگ) مـارە بکـاو رێگـای پێـدان کـە وەك خوشـك و بـرا لەگـەڵ یـەکتر هەڵسوکەوت بکەن، بەم شێوەیە هەردوو ئەویندارەکـە پـشتیان بـە (هۆنگیـانگ)ی خزمەتکاری (یەنگینگ) بەستبوو، تا نامەو شیعری خۆشەویستی بـۆ یـەکتر رەوان بکەن. هۆنگیانگ کاتی ژوانـی ئـەو دوو ئەویـندارەی رێـك دەخـستو دواتـریش لـە کۆتاییدا هەردووك بوونە هاوسەری یەکترو زەماوەندیان کرد.

لەوەبـەدوا، وشـەی (هۆنگیـانگ) بـە مانـای رێکخـەرو پێنـاوی هاوسـەرگیری بەکاردێت.

## (١٠٠)

# (گرانی لیو) لە باخە گەورەکەدا



ئـەم دەربڕینــە لــە هەقایــەتی بــەناوبانگی (خــەونی کۆشــکە ســوورەکان) ی سەردەمی (کینگ)ەوە وەرگیراوە، باخچەی گـەورە شـوێنی مانـەوەی خانـەوادەی بەهێزو دەوڵەمەندی (جیا) بوو.

(گرانی لیو) یش خانمە جوتیـارێکی دەسـت کـورت بـوو، بـۆرە خزمایەتییـەکی لەگەڵ خانەوادەی (جیا) هەبوو، لەبەرئەوە هاتە بـاغی گـەورەو داوای یارمـەتی لێ کرد.

(جیا) خاتوونی گەورەی ماڵ بوو، زۆر لە ژیـانی ڕۆژانـەی خـۆی بێـزار بووبـوو، هیوای دەخواست شتێکی تازە هەبێو ڕۆژی پێ بەسەر ببا، بۆیە داوای لە (گرانـی لیو) کرد، چەند ڕۆژێك لای بمێنێتـەوە، گرانـی لیـویش خـاتوونێکی هـەژاری گونـد بـوو، لـەو شـوێنە خـۆشو نوێیـەدا، چـونکە نـەیبینی بـوو، کەوتـە زۆر هەڵـەی پێکەنیناوی.

لەوەبەدوا، دەربڕینی (گرانـی لیـو لـە بـاغی گـەورەدا) بـۆ وەسـفی کابرایـەکی خۆبەکەم زان، کە لـە دەوڵەمەنـدێك بترسـێ، یـان بـۆ داواکـردن لـە کەسـێکی تـر، بەکاردێت.

**وەرگێڕ**

**٢٠١٠/٤/٢٠**

**شەقلاوە– کاوانیان**

## پاشبەند

## ژیاننامەی هەندێ لە نووسەرو ئەدیبە ناودارەکان

تێبینی: ئەم پاشبەندە کە ژیاننامەی هەندێ لەو شاعیرو نووسەرانەیە کە لەم چیرۆکانەدا ناویان هاتووە، لە دەقە عەرەبییەکەدا نەبوون، بەڵکو لە سەرچاوەیەکی ترەوە هێناومەو کردوومە کوردی.

هێمن عومەر خۆشناو

### بان گو (٣٢- ٩٢) BANG Gu

مێژوونووس (بان گو)، لە بەرەبابی ئەو فەرمانبەرە رەسەنانەیە کە بە فەلسەفی کۆنفۆشیۆس تێربووونە، بان گو بەرهەمێکی مێژوویی باشی بەجێ هێشتووە. بە گرنگترین شاعیری سەدەی یەکەمی زاینی دادەنرێ. باوکی بان گو کە ناوی (بان بییاو) بووە بە مەبەستی تەواوکرنی مێژووی هان–ە کانی پێشوو، پێش مردنی دەیان بەشی نووسیوە، بۆیە کوڕەکەیشی بڕیاری دا بەدواداچوون بۆ کارەکانی باوکی بکا. بەلآم لە ساڵی ٦٢ زیندانی کرا، بەبیانووی ئەوەی بە بێ ئیزنی رەسمی هەوڵی نوسینەوەی مێژووی وڵاتی داوە. لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە توانای نوسینی ئەدەبی هەبووە. لە میانی کارکردن لە نووسینەوەی مێژووی خانەوادەی فەرمانڕەواوە، دوو چامەی درێژی لە جۆری (فی) دەربارەی (شانگ ئان)ی پایتەختی دێرین نووسی. هەروەها ئەو بەیاننامەیەشی نووسی کە لە کۆڕی

گەورەو سەیدایانی کۆنفۆشییەکان لە ساڵی ٧٩ لـە هـۆڵی پڵنگـی سـپی (بـی هـی تونگ یی) بەسترا.

لە ساڵی ٨٢ ئەو بەشانەی لـە مێـژووی (هـان) بـە درێـژایی بیـست سـاڵ کـارکردن نوسی بووی پێشکەشی تەختی دەسەلاتی کرد. لە ساڵی ٩٢ بـە تۆمـەتی خیانـەت دەستگیرکراو پێش دادگاییکردنی کۆچی دوایی کرد.

چامەکانی (فـی) جـۆرە تایبەتمەندییـەکی هـەبوو لای بـان گـو، کـە لـە دەقـەکانی (سیما کزیانگری) و (یانگ کسیۆنگ)ی (هان)ەکانی پێشوو، جیـاواز بـوو، ئەمـەش زیاتر لـە وەسـف و هەسـتە بەرجەسـتەکانی بـوو. ئـەم جـۆرە شـیعرە، دوای ئـەو نەگەیشتە پلەیەکی بالاَ و بەڵکو تایبەتمەندییەکی بان گو بوو.

کتێبی (هانشو) بە یەکێك لە شاکارەکانی ئەو دادەنرێ، چ لە ئاسـتی ئـەدەبی یـان مێژوویی. بە شێوازەکەی کە کەم درێژبڕو زۆر وردترە لە شێوازی (سیما کییان)، و لـەویش کۆنفۆشیۆستریـشە. بـەلاَم بیروڕایەکـەی کـاری نەکردۆتـە سـەر روانینـە بابەتیانەکەی بۆ مێژوو. نوسـەرێکی مەزنـە وەسـفی ژیـانی مرۆڤایـەتی بـە هـەموو ئالۆزییەکانی دەکات.

## تـاوکیـان ( تـاویـا نمینگ ) ( ٣٦٥- ٤٢٧ ) TAO Qian

تاوکیان کە بەناوە ئەسڵییەکەیشی (تاویـانمینگ) ناسـراوە. نازنـاوی (کیـان) واتـە شاردراوە، لە کاتی رووخانی زنجیرەی (جین لە ساڵی ٤٢٠) وەرگرت، بە ناوبانگ و رێزەوە ناسراوە، ئەمـەیش لەبـەر کەسایەتییەکەی، نـەك لەبـەر شـاعیربوونەکەی.

ئـەم شـاعیرە ، تـا سـەدەی یـانزە نـەبووە یـەکێك لـە سـێ یـان چـوار شـاعیرە گەورەکـەی چـین، لـەو سـەدەوە تـا ئێـستا سـالاَنە دەیـان کتێـب و وتـار لەسـەر

بەرهەمەکانی دەنووسرێن. وێڕای ئەوەی ئەم شاعیرە بە ئەسڵ دەچێتەوە سەر (شانگ شا ٢٥٩-٣٣٤) کە رزگارکەری زنجیرەی (جین)ـە، بەڵام ئینتیمای بۆ یەك کەسیش لەو خێزانە ئورستوکراتیە مەزنە نەبوو کە دەسەڵاتیان قۆرخ کردبوو لەوسادا.

ئەو لە تەمەنی بیست و هەشت ساڵی دا دەستی بە کاری گشتی کرد، بەردەوامیش نەبووو تەنیا سێزدە ساڵانی کار کرد (٣٩٣- ٤٠٦)، ئەو کارانەیشی لە پلەی سادە دابوو. سەرەتا وەك فەرمانبەرێکی بچووك لە بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکەی خۆی (جیانگ زو)، (جی جیانگی ئێستا) بۆ ماوەیەکی کەم پاش شەش حەوت ساڵ لە ساڵی ٤٠٠ بووە یاریدەدەری ژەنەڕاڵ (هوان کزان) کە تەختی بەرەبابی (جین)ی لە ساڵی ٤٠٤ لەناوبرد. لە ساڵی پاشتریٚ لەبەر ماتەمی دایکی وازی لە کار هێناو تا ساڵێك نەگەڕایەوە سەر کارەکەی, دواتر بووە یاریدەدەری (لی یی) کە یەکەم ئیمپراتۆری بەرەبابی (سۆنگ) بوو. لە بیست ساڵی کۆتایی ژیانیدا بووە کەسێکی ئاسایی و زەویی خۆی بەخۆی کشت دەکردو برسیو ماندوو دەبوو (وەك لە یەکێك لە قەسیدەکانی دیارە. قەسیدەی ژمارە ١٥)

١٢٦ قەسیدەی شیعری بۆ جێهێشتوین، کە زۆربەیان باسی ئازادی دەکەن.. تاوکیان بەر لە هەمو شتێك کەسێکی رەسەن بوو، تاوییەکان و بووزییەکان لە جیهان دووردەکەوتنەوەو داوای نەمری (نێرڤانا)یان دەکرد. کۆنفۆشیۆسەکانیش لە خزمەتی پاشاو گەورەکان رایاندەکرد، بەتایبەتی ئەوانەی شیاوی خزمەت نەبوون. تاوکیان دڵی بە بوزی و تاوی خۆش نەبوو، لە زۆر لە قەسیدەکانی راستەوخۆ کۆنفۆشیۆس دەدوێنیٚ و هەوڵی ئەوە دەدا ئەم حەکیمە ئیقناع بکا

بەوەی کە ئاسۆی فەلسەفەکەی فراوان بکا، بە جۆرێك کشتوکاڵ بکەن و پیاو لە ژیانی تایبەتی خۆی پشت بە دەوڵەت نەبەستێ.
تاوکیان لە قەسیدەکانی ژیانی رۆژانەمان بۆ وێنا دەکا، بە شێوەیەك لە هەمان کاتدا جۆرێکی نوێ دادەهێنێ کە پێی دەوترێ (تیان یان شی) واتە شیعری لادێی.
لە دەقەکانی وەسفی رۆشنایی و تریفەی مانگ لە یانگ زی و ناوچە بە بەفر داپۆشراوەکان دەکات.

**دومو DU Mu (٨٠٣-٨٥٢)**

دومو لە دەڤەری پایتەخت (کزی ئان)ی ئێستا هاتۆتە دونیاوە، یەکێکە لە گەورەترین شاعیرەکانی ئاخرو ئۆخری سەردەمی حوکمی بەرەبابی (تانگ)، لە بەرەی ماندرێنیە یە. لە تەمەنی بیست و شەش ساڵی دکتۆرای بەدەست هێناوە.
هەر لە تەمەنێکی زووەوە دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد لە کلاسیکیەت و کۆنفۆشی و کاروباری سیاسی، بەلاّم بیروڕایە (پێشکەوتنخوازییەکەی) ناسرابوو: **هەموو ئازارەکانی قۆناغەکە سەرچاوەکەی جەهل و نەفامی دەسەلاّتدارانە**، بەرهەمەکەی کە نەوەکەی (بیە یانهان) بۆی چاپ کرد، کەمۆکەیەکە کە پێش مردنی نەیسوتاندبوو، لەگەڵ ئەوەی ئەم نەوەیە هەندێکیشی ئەزبەر کردبوو بەناوی (فانشوان وینجی)، وێڕای هەندێ لە لێکۆڵینەوەکانی، هەمەجۆر و سیاسەت ئامێز بوون، زۆر لە دەقە شیعریەکانی واقیعی بوون و باسیان لە رووداوەکانی ولاّتەکەی دەکرد، یان هەست و سۆزی ئەوی لە بینینی دیمەنێکی سرووشتی هەندێ جاریش گاڵتەئامێزبوون بەلاّم بە شێوازێکی جوان.

## روان جی (٢١٠- ٢٦٣) RUAN Ji

(روان جـی) کـوڕی (روان یـی) یـە، کـە یـەکێك بـووە لـە حـەوت مامۆسـتاکە لـە سەردەمی (جیان ئان)، لە سەردەمی رووخانی دەسەڵاتی (ویـە) ژیـاوە، لـە هـەمو بەرهەمەکانیـدا هەوڵیـداوە ئـەوەمان بـۆ روون بکاتـەوە، کـە تـا چـەند دڵـسۆز و وەفـادارو پابەنـدبووە بـە بـەها باڵاکـان. لـە سـاڵی ٢٣٩ دا لـە خزمـەتی بـەرەبابی (سیما) کاری کرد، بێگومان هۆکاری ئەوەش لەو مێژووەدا لـە رووکەشـدا زۆر کـەم لــە خزمــەتی بــەرەبابی (ویــە) دابــوون. دوای دە ســاڵ لــە خزمــەتی ســەربازی، هەمیــشەش رەتــی دەکــردەوە کــە پلــەو پۆســتی بــەرز وەربگــرێ. بــەناوی کۆنفۆشیۆسـیەوە دەدوا، بـەڵام لـە راسـتیدا روان جـی، هـەوڵی داوە سـوود لـە فەلـسەفەی تـاوی وەربگـرێ، بەرهەمـەکانی زۆرن و بـەناوبانگترینیان (یـۆنگ هـی شــی)یـە، کـە هەشـتاو دوو قەسـیدەی سـەرواداری پێنجیـنن. تێیـدا بـاس لـە راستییەکانی دەکـات و وا دیـارە کەسـێکی غـەمبار بـوو و بـەدوای نـەمری تـاوی گەڕاوە. هەروەك لـە رووداوەکـانی سـەردەمی خۆیـشی دواوەو چـونکە سـەردەمی ژیانی ئەو سەردەمێکی زۆر تاریك بووە لە مێژووی چین.

## زوانگ زی (٣٩٦- ٢٨٦ پ. ز) ZHANG Zi

زوانگ–ی مامۆستا کە ناسراوە بە (زهو) لە کۆتاییەکانی سەدەی چـوارەمی پـێش زایین ژیاوە. دیاریکردنی ساڵی لـەدایك بـوون و مردنـی بـە شـیمانە دانـدراوە. ئـەم بیرمەندە قازییەکی باشی سەردەمی خـۆی بـووەو زۆر لایەنـەکانی (تـاوی)مـان بـۆ دەخاتە روو. بەڵام بە هونەرەکەی لە بیروبڕواکەی دەردەچێت و ئـەدەبێکی چـینی پـێش دووهـەزار سـاڵ زیـاتر نیـشانی نـەوەی ئێـستا دەدات. مێژوونووسـان ئـەوە

دەستنیشان دەکەن کە کتێبی مێژووی رەسمی سەردەمی بەرەبابی زنجیرەی (هان) کتێبێکە پێی دەگوترێ (زانگزی)و لە پەنجاو دوو بەش پێك هاتووە، کە دەشێ ئەو کتێبەی ئێستا لە واقیعدا هەیە هەمان کتێب بێت. کتێبەکەش وێڕای چەند بنەمایەکی فەلسەفی کۆمەڵێك هەقایەتو ئەفسانەیشی لەخۆ گرتووە. کە ئەمە نموونەیەکی دەقی چیرۆکمان نیشان دەدات.

## کونگ رۆنگ (١٥٣- ٢٠٨) KONG Rong

کۆنگ رۆنگ بە (وینجی) ناسراوە، یەکێك لە حەوت مامۆستاکەی سەردەمی (جیان ئان)ـە، لە تەمەنی نۆساڵیدا (لی ینگ) کە یەکێ لە سەرکردەکانی حیزبی ناحەزی بوو پێشوازی لێکرد و دوای ماوەیەك زۆری نەبرد لەسەر ئاستی ئەوێ ناسراو کاری میری وەرگرت و دیارترینیان بووە بەڕێوەبەری ناحیەی (بیە هی)ی (شان دونگ). لە کۆتاییەکانی تەمەنی یەکێك بوو لەو خانەوادانەی سەردەمی (هان) کە خەباتی دژی (کاو کاو) دەکرد.

بەرەڤانی (کۆنگ رۆنگ) لە زنجیرەی (هان) و شانازییەکانی و بیرو راو ئارەزووی لە گەمەکردن بە وشەو دەستەواژەکان و رارایی لە مردن .. ئەمانە هەموویان لە قەسیدەکانی دەبینین کە لەناو بەرهەمەکانیدا گەیشتونەتە دەستمان.

## هان یو (٧٦٨- ٨٢٤) HAN Yu

ئەدیبێك بووە، بۆ یەکەم جار ناوبانگی لەوەوە پەیدابوو، کە بووە رابەری بزووتنەوەی نوێکردنەوەی پەخشانی کلاسیکی. لە ساڵی ٨٠٣ بۆ ٨١٩ هەڵبەزو دابەز بووە لە ژیانی ئەم ئەدیبە، بە هۆی ململانێی حیزب و تیرەکان، بەو هۆیەوە

لەنێوان شارو لادێدا بووە. لە ساڵی ٨١٩ کتێبێکی نووسی بەناوی (لین فو گی ببیاو) واتە (نامەیەك بۆ تەختی دەسەڵات) دژی بوزا، کە ئەمە ئیهانەیەك بوو بۆ ئیمپراتۆر، بۆیە بۆ (فیجیان)یان دوورخستەوە. بۆ ساڵی پاشی هاتەوە پایتەخت تا هەندێ پۆست وەربگرێ، هەتا ساڵی ٨٢٤ کە کۆچی دوایی کرد. هان یو کۆنفۆشییەکی توندڕەو بوو. بە درێژایی ژیانی حەزی لەوەبوو رێگای دێرینەکان بەرنەدا لە پێناوی گەڕانەوە بۆ پەخشانێکی سادەو روون. بەرهەمەکانی وێڕای نامەیەك بۆ عەرش، بنەماکانی رێگا و موحازەڕەکان دەربارەی مامۆستایان)ن.

## وانگ کزیهی ( ٣٢١- ٣٧٩ )

لە مەزنترین خۆشنووسەکانی ئەو سەردەمانەی چین بووە. پێشەکی بۆ زۆر لە دیوانی شیعرەکان نووسیوە. بە زۆری خۆشنووسە بەناوبانگەکان ئەدیبی بەناوبانگیش بوونە، ئەمەش ئەوەی سەلماندبوو کە هونەرو ئەدەب تەواوکەری یەکترن.

بڕوانە (اندریە لیڤی، معجم الادب الصینی، ترجمە د. محمد حمود. بڵاوکراوەی (مجد) بیروت، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨. (وەرگێڕی کوردی).

| | |
|---|---|
| کسیا | سەدەی ۲۱– سەدەی ۱٦ پێش زاین |
| شانگ | سەدەی ۱٦– سەدەی ۱۱ پ. ز |
| زوی رۆژئاوا | سەدەی ۱۱– ۷۷۱ پ. ز |
| زوی رۆژهەلاّت | ۷۷۰– ٤۷٦ پ. ز |
| سەردەمی بەهارو پایز | ۷۷۰– ٤۷٦ پ. ز |
| سەردەمی ویلایەتە شەڕکەرەکان | ٤۷٥ – ۲۲۱ پ. ز |
| کین | ۲۲۱– ۲۰٦ پ. ز |
| هان–ی رۆژئاوا | ۲۰٦– ۸ی زاین |
| کسین | ۹– ۲۳ز |
| هان–ی رۆژهەلاّت | ۲٥– ۲۲۰ز |
| سیٚمیرنشینەکە | ۲۲۰– ۲۸۰ز |
| وی | ۲۲۰– ۲٦٥ز |
| شۆ | ۲۲۱– ۲٦۳ز |
| وو | ۲۲۲– ۲۸۰ز |
| جینی رۆژئاوا | ۲٦٥– ۳۱۷ز |
| جینی رۆژهەلاّت | ۳۱۷– ٤۲۰ز |
| هەردوو میرنشینی باکوورو باشوور | ٤۲۰– ٥۸۹ز |

## زنجیرەکانی باشوور

| | |
|---|---|
| سۆنگ | ٤٢٠– ٤٧٩ز |
| کی | ٤٧٩– ٥٠٢ز |
| لیانگ | ٥٠٢– ٥٥٧ز |
| چن | ٥٥٧– ٥٨٩ز |

## زنجیرەکانی باکوور

| | |
|---|---|
| ویی باکوور | ٣٨٦– ٥٣٤ز |
| ویی رۆژهەلأت | ٥٣٤– ٥٥٠ز |
| ویی رۆژئاوا | ٥٣٥– ٥٥٦ز |
| کیی باکوور | ٥٥٠– ٥٧٧ز |
| زویی باکوور | ٥٥٧– ٥٨١ ز |
| سویی | ٥٨١– ٦١٨ز |
| تانگ | ٦١٨– ٩٠٧ز |
| وو زو | ٦٨٤– ٧٠٤ز |
| پێنج زنجیرەکەو دە میرنشینەکە | ٩٠٧– ٩٦٠ز |

## پێنج زنجیرەکەی باکوور

| | |
|---|---|
| لیانگ | ٩٠٧- ٩٢٣ز |
| تانگ | ٩٢٣- ٩٣٦ز |
| جین | ٩٣٦- ٩٤٧ز |
| هان | ٧٤٩- ٩٥٠ز |
| زو | ٩٥١- ٩٦٠ز |

## دە میرنشینەکەی باشوور سیستەمێکی دەسەڵاتی کورت خایەن بوون

| | |
|---|---|
| سۆنگی باکوور | ٩٦٠- ١١٢٧ز |
| سۆنگی باشوور | ١١٢٧- ١٢٧٩ز |
| لیاو | ٩٣٨- ١١٢٥ز |
| جین | ١١١٦- ١٢٣٤ز |
| یوان | ١٢٧١- ١٣٦٨ز |
| مینگ | ١٣٦٨- ١٦٤٤ز |
| کینگ | ١٦٣٦- ١٩١١ز |
| کۆماری چین | ١٩١٢- ١٩٤٩ز |

# پێرست


| ز | بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |
| ١ | چما بەکارهێنانی تەورداس بۆ مریشك کوشتن؟ | ٥ |
| ٢ | ستەمکاری لە پڵنگ بەزەڕترە | ٧ |
| ٣ | کلکە بیور دروستکردن | ٩ |
| ٤ | سووربوون لەسەر شەڕ، خۆ فەوتاندنە | ١١ |
| ٥ | کشانەوە سێ شییە | ١٣ |
| ٦ | خواستنی کورتە ڕێگایەك بۆ بەزاندنی (گۆ)<br>کە لێو نەمێنن، چەقە چەقی ددانان دێ | ١٧ |
| ٧ | پرسیار کردن لە پەیکەرەکان | ١٩ |
| ٨ | پەنجەی خستە نێو قازانەکە | ٢١ |
| ٩ | قامچییە درێژەکەش ناگاتە هەموو شوێنێك | ٢٣ |
| ١٠ | فێڵم لێ بکەی، فێڵت لێدەکەم | ٢٥ |
| ١١ | هێزێکی زیاتر بۆ فرۆشتن | ٢٧ |
| ١٢ | بڵندکردنو نەویکردنی دەست | ٢٩ |
| ١٣ | هاوڕێیەتی نێوان (گوان)و (باو) | ٣١ |
| ١٤ | مالأتی راکردووش ناتوانێ بگاتە لای هەندێکیان | ٣٥ |
| ١٥ | گیاکردنە ریسەو ئەنگوستیلە دانان لەنێو دەم | ٣٧ |
| ١٦ | چاوگێڕانو بابەت گۆڕین | ٤١ |
| ١٧ | لەسەر تەپۆلکە دانیشتن بۆ چاوەدێری پڵنگە دڕندەکان | ٤٣ |
| ١٨ | کەروێشکە فێڵزانەکە سێ کونی لانەی هەن<br>سەرینەکەت تەواو دانێو بەسەلامەتی بنوو | ٤٥ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٩ | فشۆڵ وەك لەسەریەك کەڵەکەبوونی هێلکە | ٤٩ |
| ٢٠ | سەرەتا لووتبەرزو دواتر بەخشندە | ٥٣ |
| ٢١ | ئەو تەڵەیەی بۆ خەڵکی تری دانابوویەوە خۆی پێوەبوو | ٥٧ |
| ٢٢ | شاکارێکی دەگمەنەو شیاوە بۆ بە هەند هەڵگرتن | ٥٩ |
| ٢٣ | ئەمری کرد کە میوانەکان دەربکرێن | ٦١ |
| ٢٤ | وشەیەك یەکسانە بە هەزار پارچە زێڕ | ٦٣ |
| ٢٥ | چۆن (سنۆنۆ) بە هیوایەتەکانی قوڵنگ دەزانێ؟ | ٦٥ |
| ٢٦ | دەرکردنو جێگرتنی ئاسانە | ٦٧ |
| ٢٧ | با سەرفەتاح بە لێدان بێت | ٦٩ |
| ٢٨ | ئەو بەزینەی کە هەموو شتێ تێكو پێك دەشکێنێ | ٧١ |
| ٢٩ | کوڕە شایانی فێرکردنە | ٧٣ |
| ٣٠ | چاودێری کردنی شەڕ لە مەتەرێزەوە | ٧٥ |
| ٣١ | بردنەوەو دۆڕان لەسەر دەستی کسیاوهی | ٧٧ |
| ٣٢ | راوی مامزان لەناو پێدەشتەکاندا | ٧٩ |
| ٣٣ | رێککەوتن لەسەر یاسای سێ خاڵەکە | ٨١ |
| ٣٤ | زیافەتو سەمای شمشێران لە هۆنگمان | ٨٣ |
| ٣٥ | ئەوان چەقۆو تەختەقیمەن، ئێمەش ماسیو گۆشت | ٨٧ |
| ٣٦ | چاككردنی رێگاو دروستکردنی سەرولێژێکی نهێنی | ٨٩ |
| ٣٧ | کوشتارو رووبار لەدواتەوەن | ٩١ |
| ٣٨ | ئازاییەکی سەرەڕۆو چاکەیەکی ژنانە | ٩٣ |
| ٣٩ | پڵنگ پەروەردەکردن، واتە بەلا هێنان | ٩٥ |
| ٤٠ | شەوڕۆکردن بە جلی ئاوریشم | ٩٧ |

| | | |
|---|---|---|
| ٤١ | مەیموون لەگەڵ شەپقە | ٩٩ |
| ٤٢ | هەرکاتێك (هان کسین) ئەمری دەکرد سوپا زیاتر بێ، ئەوا باشتر دەبوو | ١٠١ |
| ٤٣ | لە رووبەڕووبوونەوەی پیاوماقوڵانی رۆژهەڵاتی یانگتزی، زۆر شەرمەزار بوو | ١٠٣ |
| ٤٤ | سەرکەوتن لە خێوەتی سەرکردایەتییەوە دێتە دی | ١٠٥ |
| ٤٥ | لە کاتی لەناوبردنی کەروێشکە کێوییە فێڵبازەکان، سەگی راوێ دەکوژرێن | ١٠٧ |
| ٤٦ | باڵەکان تەواو گەشانەوە | ١٠٩ |
| ٤٧ | کاوکان بە دوای دەستوورەکانی کسیاوهی دەکەوێ | ١١١ |
| ٤٨ | بەرزرکردنەوەی دەستی چەپ | ١١٥ |
| ٤٩ | نیشاندانی جوانی لە ماڵێکی زێڕیندا | ١١٧ |
| ٥٠ | راوی پاسارییان لەبەر دەرگا | ١١٩ |
| ٥١ | گاوان‌و کچە بەرگ درووەکە<br>دروست کردنی پردێك لە قەلەباچکە | ١٢١ |
| ٥٢ | باڵندەی سیمرخی دەهەزار (لی) دەفڕێ | ١٢٣ |
| ٥٣ | نیگەرانی لە جۆنی کوتان | ١٢٥ |
| ٥٤ | شێدارکردنەوە بە یاریکردن | ١٢٧ |
| ٥٥ | تا بەراوردکردنەکە سادەتر دەبوو، زیاتر پوخت دەبوو | ١٢٩ |
| ٥٦ | بازاڕی ماسیی دێمەکار | ١٣١ |
| ٥٧ | پارچەکردنی گایەکە<br>رووبەرێکی گەورە بۆ چەقۆی گۆشت فرۆشەکە | ١٣٣ |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٨ | کارێکی بە ماندووبوون، بەڵام بێ کەڵك | ١٣٥ |
| ٥٩ | بە ڕێگایەکی ترسناك حسێب کردن | ١٣٧ |
| ٦٠ | گۆڕینەوەی دەفری هاونشینانی ئیمپراتۆر بە مەنجەڵی مجێورو سواڵکەران | ١٣٩ |
| ٦١ | هەردوو دەست وەڵامی دڵ دەدەنەوە | ١٤١ |
| ٦٢ | ئاوی ڕژاو هەڵناگیرێتەوە | ١٤٣ |
| ٦٣ | پشکۆی دامرکاو، جارێکی تر دەگەشێتەوە | ١٤٥ |
| ٦٤ | گۆڕینەوەی پەرەمووچ بە شمشێر | ١٤٧ |
| ٦٥ | پێویستە بچیتە لانەی پڵنگ، تا بەچکەکانی بدۆزیتەوە | ١٤٩ |
| ٦٦ | کفنی پاڵەوانان | ١٥١ |
| ٦٧ | فاڵچییەکی چکۆلە، لەبەرامبەر جادووگەرێکی مەزن | ١٥٣ |
| ٦٨ | سینی هەڵگرتن لەراست بەراستی هەردوو برۆیان | ١٥٥ |
| ٦٩ | شمشێر هەڵگرتن | ١٥٧ |
| ٧٠ | هەموو داواکە بۆ بای رۆژهەڵاتە | ١٥٩ |
| ٧١ | دەڵێی قولنگە لەنێو مریشکان دا | ١٦١ |
| ٧٢ | من زۆر کەیفخۆشم، کە (شۆ)م هەر بە بیر نەماوە | ١٦٣ |
| ٧٣ | مەرایی نەکردن لەبەرامبەر پێنج داوییە برنجان | ١٦٥ |
| ٧٤ | زەویی پۆخەکانی خۆخ | ١٦٧ |
| ٧٥ | کە کابرای تاوی دەگات، تەنانەت ئاژەڵەکانیشی بۆ بەهەشتی هەمیشەیی لەگەڵی دەچن | ١٦٩ |
| ٧٦ | دەریاکان دەبنە زەویی گۆلە برنجان‌و زەویی برنجانیش دەبنە دەریا | ١٧١ |

| | | |
|---|---|---|
| ٧٧ | ئەو شتانە | ١٧٣ |
| ٧٨ | دوو بیرمەندی رەنگ پەڕیو | ١٧٥ |
| ٧٩ | کاغەز لە لۆیانگ گرانە | ١٧٧ |
| ٨٠ | یارمەتی (کین) لە بەیانیان‌و (چێو) لە ئێواران | ١٧٩ |
| ٨١ | پاڵکەوتوو لەلای رۆژهەڵات | ١٨١ |
| ٨٢ | لەبن هێلانەیەکی سەرنخون، هێلکەیەکی ساغ نییە | ١٨٣ |
| ٨٣ | تاڤگەیەك لە وشە | ١٨٥ |
| ٨٤ | سەرنجە رەشەکان | ١٨٧ |
| ٨٥ | بەهرەکانی بەڕێز جیانگ کەشەنگ بووە | ١٨٩ |
| ٨٦ | ئەو پێیانەی بە پەتی سوورەوە بەستراون | ١٩١ |
| | پیرەمێردی بەر تریفەی مانگەشەو | |
| ٨٧ | توورەگەی سەیدا روان شەرمەزارە | ١٩٣ |
| ٨٨ | دیمەنی ئاسایی سیکۆنگ | ١٩٥ |
| ٨٩ | چوونە ناو مەنجەڵەکە، تکایە | ١٩٧ |
| ٩٠ | باغی هەڵووژە | ١٩٩ |
| ٩١ | لانەی گەرم‌و خۆش | ٢٠١ |
| ٩٢ | خەونی زێڕینی دارگەسك | ٢٠٣ |
| ٩٣ | خەونی کەدەداری ژێری | ٢٠٥ |
| ٩٤ | قازییەکان ئاگر دادەگیرسێنن، بەڵام خەڵك چرایەکان هەڵناکەن | ٢٠٧ |
| ٩٥ | پیاوی بەفر | ٢٠٩ |
| ٩٦ | پیلانی پەنجەرەی رۆژهەڵات | ٢١١ |
| ٩٧ | پاڵ پێوەنیێو – لێبدە | ٢١٣ |

| | | |
|---|---|---|
| ٩٨ | گەلاَ سەوزەکان، سێبەرێکی خۆشییان لیَ بەرهەم دیَ | ٢١٥ |
| ٩٩ | هۆنگنیانگ | ٢١٧ |
| ١٠٠ | (گرانی لیو) لە باخە گەورەکەدا | ٢١٩ |
| | پاشبەند | ٢٢١ |
| | پێرست | ٢٣١ |

**سوپاسی تایبەتیم بۆ بەڕێزان:**

**(ئاسو خالید) و (نەورۆز جەمال) و (عومەر عەبدوڵلاّ) کە**

**لە نەخشەسازییەکەدا ماندوبوونی زۆریان کێشاوە**

## زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠١١ی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
## بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
## بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | نرخ | لاپەڕە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٥٣٢ | مذكرات يوسف حنا يوسف (أبو حكمت) | يوسف حنا يوسف | مذكرات | ٥٠٠٠ | ٢٦٤ |
| ٥٣٣ | لە کەناری هزرو زمان و ئەدەبدا | عەبدولرەحمان مەعرووف | وتار | ٢٠٠٠ | ١٩٢ |
| ٥٣٤ | لێکدانەوەی شیعر و ئاماژەکانی پشتەوەی تێکست | ئاوات محەمەد | رەخنەی ئەدەبی | ٢٠٠٠ | ١٨٤ |
| ٥٣٥ | پیاسەیەك لەگەڵ زەردخەنەی (با) | سەرهەنگ خامۆش | شیعر | ١٥٠٠ | ١٢٠ |
| ٥٣٦ | بژی نیشتمان | و. عەبدولستار جەباری | چیرۆك | ١٥٠٠ | ١١٢ |
| ٥٣٧ | پەندێن ژیانێ گوتنێن زانا ناڤدارین جیهانێ | محەمەد ساڵح پێندرۆیی | گشتی | ٥٠٠٠ | ٣٢٨ |
| ٥٣٨ | خەم و خەندە | عوسمان رسول | شیعر | ١٥٠٠ | ١٢٠ |
| ٥٣٩ | هونەری گوێگرتن | و. بەهزاد حەوێزی | دەروونناسی | ٣٠٠٠ | ٢٤٦ |
| ٥٤٠ | فیلەکەی نادر شا | د.موحسین ئەحمەد | رۆمان | ١٠٠٠ | ٦٤ |
| ٥٤١ | فێمێنیزم و چەند خوێندنەوەیەکی تازە | و.ئامادەکردنی:بەیان عەزیزی | گشتی | ٣٠٠٠ | ٢٠٠ |
| ٥٤٢ | هونەرەکانی پەخشان لەگۆڤاری زاری کرمانجیدا (١٩٢٦-١٩٣٢) | مستەفا ساڵح مستەفا | ئەدەب | ٥٠٠٠ | ٢٢٤ |
| ٥٤٣ | فیکرو فەلسەفە دەقی جیهانی | و. تاریق کاریزی | لێکۆڵینەوە | ٥٠٠٠ | ٣٣٦ |
| ٥٤٤ | ئایندەسازی | تاهیر عوسمان | کۆمەڵە وتار | ٣٠٠٠ | ١٩٢ |
| ٥٤٥ | مرۆڤ و جڤاك | د. عارف حیتۆ | کۆمەڵە وتار | ٣٠٠٠ | ٣١٢ |
| ٥٤٦ | بیرەوەرییەکانم | مستەفا عەسکەری | بیرەوەری | ٥٠٠٠ | ٣٦٠ |
| ٥٤٧ | هێلانەکەم لە کوردستان | سازان مەدحی مەندەلاوی | گشتی | ٥٠٠٠ | ٣٠٤ |
| ٥٤٨ | عەلی شوون هەڵگر | تەحسین شێروانی | فۆلكلۆر | ٢٠٠٠ | ٨٠ |
| ٥٤٩ | خەیاڵێکی پووچ | بەختیار نادر | کورتە چیرۆك | ١٠٠٠ | ٤٠ |
| ٥٥٠ | هەقایەت وئەفسانەی میللەتان | ئیدریس عەبدوڵڵا | فۆلکلۆر | ٣٠٠٠ | ٢٧٢ |
| ٥٥١ | ئەدەب وەك بەشێك لەروح | غەمگین بۆلی | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | ٢٠٠٠ | ١٣٦ |
| ٥٥٢ | دەروازەیەك بەرەو فەلسەفە | کامەران تاهیر | وتار | ١٠٠٠ | ٨٨ |
| ٥٥٣ | خەونی شادی | کۆکردنەوەو نووسینی نیازی حەمە عەزیز | شیعر | ٢٠٠٠ | ٢٠٨ |
| ٥٥٤ | چەپکە گوڵێکی رێبوار بۆ کوردستان | ئەبوبەکر عەلی ئیسماعیل | شیعر | ٢٠٠٠ | ٢٤٨ |
| ٥٥٥ | سیاسەتی ئەمریکا لە کوردستان لە روانگەی پسپۆڕانی رۆژئاوایی | ئا: وریا رەحمانی | سیاسی | ٤٠٠٠ | ٢٨٠ |
| ٥٥٦ | سياسة الحكم | ترجمة: عبدالرحمن الپاشا | دراسات | ٣٠٠٠ | ١٦٨ |
| ٥٥٧ | کوردو ئیسلام | ئەحمەد بالایی | مێژوویی | ٥٠٠٠ | ٥٤٨ |
| ٥٥٨ | ساتی راستگۆیی | و: شەرمین عەبدوڵڵا | کورتە چیرۆك | ٢٠٠٠ | ١٣٦ |
| ٥٥٩ | مەرگی گەڕانەوە | سامی سلێمان فەقێ | رۆمان | ٣٠٠٠ | ٢٠٤ |
| ٥٦٠ | دەردی دووری | د. رەفیق شوانی | شیعر | ٢٠٠٠ | ٢٠٨ |
| ٥٦١ | پرسیار لە دەرەوەی سێوەکەی نیوتن | ئا: سۆران عەزیز | گشتی | ٣٠٠٠ | ٤١٦ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٥٦٢ | عەرووز وەکو پێوەرێك بۆ ساغکردنەوەی شیعری نالی | یادگار رەسوول باڵەکی | لێکۆڵینەوە | ٤٠٠٠ | ٦٢٤ |
| ٥٦٣ | هەورە تریشقە | موکەڕەم رەشید تاڵەبانی | چیرۆك | ٣٠٠٠ | ١٦٨ |
| ٥٦٤ | بەڵێنەکانی ئینگلیز و گوتاری منەووەرانی کورد | بەهات حەسیب قەرەداخی | سیاسی | ٢٠٠٠ | ١٢٠ |
| ٥٦٥ | فاعلية المسرح الليبي.. بين الفكر والفن | أ.د. فيصل ابراهيم المقدادي | فنون مسرحية | ٥٠٠٠ | ٥٤٤ |
| ٥٦٦ | پل | عەزیزی مەلای رەش | رۆمان | ٣٠٠٠ | ٢٩٦ |
| ٥٦٧ | شێوازە ئەدەبییەکانی رۆژنامەی خەبات (٢٠٠٣-٢٠٠٦) | د. ئاریـانا ئـیبراهـیم | رۆژنامەنووسی | ٥٠٠٠ | ٥٦٠ |
| ٥٦٨ | یانەی وەرزشی سۆلاف لەیادی (٤١) ساڵەیدا | ن. ئا: شێخ ستار عەبدوڵلا بەرزنجی | وەرزشی | ٤٠٠٠ | ٢٩٦ |
| ٥٦٩ | پێنج داستانی کوردەواری | یاسین حەسەن گۆران | فۆلکلۆر | ٣٠٠٠ | ٢٤٨ |
| ٥٧٠ | النظام العالمي الجديد وقضايا القوميات والأقليات في الشرق الأوسط | ريبوار عبدالرحيم بابكەيي | سياسي | ٣٠٠٠ | ٢٨٨ |
| ٥٧١ | وەرە با یاری بکەین | وەرگێڕانی: رەشاد محەمەد موراد | زانستی | – | ٤٨ |
| ٥٧٢ | سیڤییەکان٢ | ئا– وەرگێڕانی: شێرزاد هەینی | گشتی | ٣٠٠٠ | ٢٦٤ |
| ٥٧٣ | الادب الكوردي | د. كمال معروف | ادب | ٢٠٠٠ | ٨٠ |
| ٥٧٤ | منطقة ريكان | آراز أسماعيل عبدالله الريكاني | جغرافية | ٢٠٠٠ | ٩٦ |
| ٥٧٥ | فێربوونی زمانی ئیتاڵی لەسەفەرو لەماڵ.. لە هەر کۆڕو کۆمەڵێکدا | رەحیم شا محەمەد | زمان | ٢٠٠٠ | ١٨٤ |
| ٥٧٦ | هزرکرن د پرسێن فەلسەفێ دا | محسن ئۆسمان | هزر | ٣٠٠٠ | ٣٤٠ |
| ٥٧٧ | بووکە بەردینە | ئازاد کەریمی | ئەدەب | ٢٠٠٠ | ١٢٨ |
| ٥٧٨ | بنیاتی هونەری لەشیعری ئەحمەد موختار بەگی جاف دا | م. سعد فاروق یوسف شیخ بزێنی | ئەدەب | ٣٠٠٠ | ٢٤٨ |
| ٥٧٩ | تاقیگەی دیڤیدی | ئا. ئەنوەر نیلوفەری | IT | ٥٠٠٠ | ٤١٦ |
| ٥٨٠ | بەپێکیك دەڵێم بمبورە ناتخۆمەوە | چنار نامیق | شیعر | ٢٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٥٨١ | ئەنفال | شاخەوان شۆرش | سیاسی | ٣٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٥٨٢ | آیین یارسان | بەهمەن بەهرامی | گشتی | ٣٠٠٠ | ٤٠٠ |
| ٥٨٣ | کاتێك شیعر زمانی دەپژێ | سوارە قەڵادزەیی | شیعر | ٢٠٠٠ | ٣٤٤ |
| ٥٨٤ | أرض على قرني ثور | هونر كريم | روايه | ١٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٥٨٥ | خەتەنەکردنی مێینە زیانەکانی و حەرامکردنی لە قورئاندا | و. محسن حسين شيخ محمد | گشتی | ٢٠٠٠ | ١١٢ |
| ٥٨٦ | رێبازا سێیەم | و. جەنگیز شکاك | هزری | ٢٠٠٠ | ١٦٠ |
| ٥٨٧ | DERWÊŞÊ EVDÎ | Amer Çelik | Destan | ١٠٠٠ | ١٧٦ |
| ٥٨٨ | لەبەر ئاگردانی مام سۆفی حسێن گراوی | موزەفەر حسێن عەزیز گراوی | فۆلکلۆر | ٢٠٠٠ | ١٧٦ |
| ٥٨٩ | زەردەخەنەکانی ناو هەگبەی گەردی | ن. ئامادەکردنی: حەمید گەردی | گشتی | ١٥٠٠ | ١٧٦ |
| ٥٩٠ | پۆرترێتی شاعیرانی ناودارانی کورد | نووسین و ئامادەکردنی: کەمال هەژار | هونەری | ٥٠٠٠ | ١٢٠ |
| ٥٩١ | وتار نووسین | وەرگێڕانی: جەمال محەمەدی | رۆژنامەوانی | ٣٠٠٠ | ٢٨٠ |

| ٥٩٢ | سوريا سابع أسوأ دولة في العالم إنتهاكاً لحقوق الإنسان | ئازاد الكردی | گشتی | ٣٠٠٠ | ٤٣٢ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٥٩٣ | نطاق مسؤولية الاطباء عن اخطائهم في التشريع العراقي والتشريعات المقارنة | زينب وحيد دحام | قانون | ٢٠٠٠ | ٩٦ |
| ٥٩٤ | تابلۆ جیهانییەکان | ئاکۆ عەبدوڵڵا | هونەری | ٦٠٠٠ | ١٦٨ |
| ٥٩٥ | ئەتڵەسی پارێزگای هەولێر | د. هاشم یاسین حەمەدەمین کامەران وەلی مەحمود | جوگرافیا | ٥٠٠٠ | ٧٢ |
| ٥٩٦ | خدری زیندە | مەجید عەبدولڕەحمان | چیرۆکی فۆلکلۆری | ٢٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٥٩٧ | سوارەکان بەقاچاغ بووکیان گواستەوە | دوارۆژ کاروان– کاروان عومەر | ڕۆمان | ٤٠٠٠ | ٢٢٤ |
| ٥٩٨ | ئاوارەیی و ژیانی کۆلەمەرگی کورد لە هەندەراندا | خۆشەوی عەلی پاپیر | سیاسی | ٥٠٠٠ | ٣٠٤ |
| ٥٩٩ | کولتوورو ناسنامە | ئازاد عەبدولواحید | ڕەخنەی ئەدەبی | ٣٠٠٠ | ٢٥٦ |
| ٦٠٠ | بەناز | مەحمود زامدار | هونەری شانۆ | ٢٠٠٠ | ٩٦ |
| ٦٠١ | ژیانی ئاینی لە نەهریێ بۆ بارزان | و. لەعەرەبییەوە: ڕەفیق مەلا کەرەم هەرکی | مێژوویی | ٥٠٠٠ | ١٨٤ |
| ٦٠٢ | چۆن ڕەفتار لەگەڵ گەشتوگوزاردا بکەین | نادر روستی | گشتی | ----- | ٨٨ |
| ٦٠٣ | خێزگەی گەڕان لەهەرێمی خەونەکاندا | ڕەووف مەحموودپوور | وتارو لێکۆڵینەوە | ٢٠٠٠ | ١٣٦ |
| ٦٠٤ | ڕامایانا | ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل | گشتی | ٢٠٠٠ | ١٩٢ |
| ٦٠٥ | لوڕستان لە مێژوودا | نووسینی: عەباس سلێمان سمایل | مێژوویی | ٣٠٠٠ | ٢٤٠ |
| ٦٠٦ | هەژار لە سنە | ئامادەکردنی: نامق هەورامی | گشتی | ٣٠٠٠ | ٢٦٠ |
| ٦٠٧ | جانتای سەفەری ئەمجارەت پڕیەتی لە گریان | خالید کۆچەر | شیعر | ٢٠٠٠ | ٢٦٢ |
| ٦٠٨ | سفر هموم أحلامي | سلوى گولي | شعر | ١٠٠٠ | ٤٠ |
| ٦٠٩ | فەرهەنگی تەکنەلۆژیای زانیاری | زانستپەروەرانی کورد | IT | ٣٠٠٠ | ١٣٦ |
| ٦١٠ | گەشی پێنج پەنجە | ع. ع. یووسف | شیعر | ١٠٠٠ | ٨٠ |
| ٦١١ | دیوانی هەوری | شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی | شیعر | ٣٠٠٠ | ٥٠٠ |
| ٦١٢ | پاڵاوتگەو تەکنەلۆژیای نەوت | فەرهاد جەمیل نادر | زانستی | ٥٠٠٠ | ٢٠٨ |
| ٦١٣ | شەوچەرەی دیوەخان | ئەبوبەکر شوان | فۆلکلۆر | ٣٠٠٠ | ٢٤٠ |
| ٦١٤ | مرۆڤ بۆ شارستانیەت؟ یا شارستانیەت بۆ مرۆڤ | و. لەفارسییەوە: عومەر قادری | زانستی | ٤٠٠٠ | ٢٨٨ |
| ٦١٥ | کیژگەلی ئەشکەوتی دێوان | محەمەد کەریم نانەوا | ڕۆمان | ٣٠٠ | ٢٤٠ |
| ٦١٦ | پەیوەندییە سیاسییەکان لە کردەوەدا | و. لە فارسییەوە:ڕەزا فەتحوڵڵا نەژاد | سیاسی | ٥٠٠٠ | ٥١٢ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦١٧ | خێملدرین ژیانێ | ئەحمەدێ هەپۆ | بیرەوەری | ٣٠٠٠ | ١٩٢ |
| ٦١٨ | هەواڵ و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی | وەرگێڕانی: دڵشاد مستەفا وەسانی | ڕۆژنامەوانی | ٢٠٠٠ | ١٣٦ |
| ٦١٩ | الطلاق الخلعي في القانون والشريعة الإسلامية وتعديله في الأقليم دراسة مقارنة | صباح صلاح الدين مصطفى | قانوني | ٢٠٠٠ | ٨٨ |
| ٦٢٠ | مێژووی سینەمای جیهان — بەرگی یەکەم | حوسێن عەبدوڵلا غەریب زادە | هونەر | بۆهەردووبەرگ ٦٠٠٠ | ٤١٦ |
| ٦٢١ | مێژووی سینەمای جیهان — بەرگی دووەم | حوسێن عەبدوڵلا غەریب زادە | هونەر | بۆهەردووبەرگ ٦٠٠٠ | ٣٧٦ |
| ٦٢٢ | باران | و. غەریب پشدەری | چیرۆك | ٣٠٠٠ | ٢٢٤ |
| ٦٢٣ | وڵاتی کەیانیان و زەردەشت و هەورامان لە ئاڤێستادا | پشکنین و توێژینەوەی د. محەمەد ئەمین هەورامانی | گشتی | ٥٠٠٠ | ٦٨٨ |
| ٦٢٤ | دەروازەیك بۆ زانستی کتێبخانەو سەنتەری زانیاری | ئا. شاهۆ عوسمان | زانیاری | ٢٠٠٠ | ٢٤٨ |
| ٥٦٢ | ئاوێنەی شکاو | و. عبدالله سەعیدی | کۆچیرۆك | ٣٠٠٠ | ١٣٦ |
| ٦٦٢ | دادگایی کردنی فرانس ڤانئانرات | علی محمود محمد | گشتی | ٣٠٠٠ | ٣٢٠ |
| ٦٢٧ | لەبارەی ئێتیکی میدیاکاری | محەمەد وەسمان | ڕۆژنامەوانی | ١٥٠٠ | ٩٦ |
| ٦٢٨ | الحب في زمن الآلم | محسن عبدالرحمن | رواية | ٢٠٠٠ | ٢٣٢ |
| ٦٢٩ | ڕومالکردنی قەیرانی سیاسیەکان لە ڕۆژنامەگەری کوردی | محەمەد عەبدوڵلا | ڕۆژنامەوانی | ٢٠٠٠ | ١٥٢ |
| ٦٣٠ | شێوەزارەکانی شاری کەرکووك | سەرکەوت عەبدوڵلا حوسێن | زمانەوانی | ٢٠٠٠ | ١٨٤ |
| ٦٣١ | هەشت دەقی شانۆیی | عبدالله سراج | شانۆیی | ٢٠٠٠ | ١٥٢ |
| ٦٣٢ | پەشتەماڵەکەی گاندی، کڵاوەکەی جێگڤارا، زەردەخەنەکی نێڵسۆن ماندێلا | کاوە ئەمین | سیاسی | ٢٠٠٠ | ١١٢ |
| ٦٣٣ | کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا | کاوە ئەمین | سیاسی | ٣٠٠٠ | ١٨٤ |
| ٦٣٤ | نەعتێکی پێغەمبەر (ص) وعەقیدەیەکی کوردی | ساغکردنەوە و لێکۆڵینەوەی د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان | ئایینی | ٢٠٠٠ | ٦٤ |
| ٦٣٥ | وەرینی لالەزارەکان | ماجید نووری | چیرۆکە هەواڵ | ١٠٠٠ | ٨٨ |
| ٦٣٦ | دیاردەی بەجیهانیبوون | عومەر ڕەسوڵ — شینکی | گشتی | ٤٠٠٠ | ٦٤٨ |
| ٦٣٧ | کلمات معربة | | لغوي | ١٠٠٠ | ١١٢ |
| ٦٣٨ | پیرەمێردی بەر تریفەی مانگەشەو (سەد هەقایەتی چینی) | وەگێڕانی بۆ کوردی: هێمن عومەر خۆشناو | گشتی | | ٢٤٠ |